# مافەکانی دراوسێ

## لە قورئان و فەرمووده صەحیحەکاندا

نووسینی
محمد ملافائق شارەزووری

چاپی پێنجەم

١٤٣٠ك ٢٠٠٩ز

📖 ناوی نامیلکە : مافەکانی دراوسێ لە قورئـان و فـەرموودە صەحیحەکاندا

✍ نووسینی : محمد ملافائق شارەزووری

❁نۆرەی چاپ : پێنجەم

❁ژمارەی لاپەڕە :٦٨

❁ تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

❁ژمارەی سپاردن:(٣٣٢)

❁ ساڵی چاپ : ١٤٣٠ك

❁ چاپخانەی : پەیوەند

تێبینی:

بۆ دەست کەوتنی ئەم بەرهەمە بە(کۆ) پەیوەندی
بکە بەم ژمارە مۆبایلەوە: ٠٧٧٠١٥٥٤٠٨٥

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ، ونستعينه ، ونستغفره ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أنه محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾
(آل عمران :١٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ (النساء /١).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾
(الأحزاب :٧٠-٧١).

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة ، وكل ضلالة في النار [1]

---

(1): هذة خطبة الحاجة التي كان الرسول (ﷺ) يفتتح بها خطبه ، ويعلمها اصحابه ، وروى هذه الخطبة ستة من الصحابة – رضوان الله عليهم – وقد أخرجها جمع من الأئمة في مصنفاتهم ، مثل الامام أحمد في (المسند) (٥/٢٧٢)، ومسلم في (الصحيح) (٢/٥٩٢، ٤٦٧) وفي (٦/١٥٣، ١٥٦ ، ١٥٧) ( بشرح النووي)، وابو داود في (السنن)(١٠٩٧) ، والنسائي في (المجتبى)(٣/١٠٤)، والنسائي (٣/١٨٨)، وابن

## پێشەکی

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە زۆر بە بەزەییە بەرامبەر بەندەکانی خۆی . ئاینی ئیسلامی بۆ ناردوون و سەر بەرزی کردوون بە پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەر (ﷺ) کە مافی هەموو شتێکی بۆ موسوڵمانان دیاری کردووە . وە ئەرکەکانیشی بۆ هەموو لایەك و تاکێك دەست نیشان کردووە . وە لە مافە گرنگەکان مافی دراوسێیە . کە بەداخەوە زۆرێك لە موسوڵمانان لێی بە ئاگانین و زۆر باش لەم باسە حاڵی نین . بۆیە بە ئەرکێکی پێویستم زانی لەسەر خۆم کە هەستم بە گەڕان بە دوای هەموو بەشەکانی ئەم باسەدا لە قورئان و فەرموودە (صحیح)ە کاندا و لەقسەی هاودڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) . وە هەروەها لە ووتە جوانەکانی (تابعییەکان)ەوە ولە پەند و ئامۆژگاریەکانی زانایانی پایە بەرزو بە ڕێزی موسڵمانان .

سەرەتا دەستم کردووە . بە پێناسە کردنی دراوسێ و دوا جار باسی مافەکانی دراوسێم کردووە . وە سوودی چاکە کردن لەگەڵ

---

ماجە في (السنن)(١٨٩٢) . والحاكم في (المستدرك) (٢ ١٨٢-١٨٣). (٣ ١٨٨). والطيالسي في (المسند)رقم (٣٣٨) . والبيهقي في (السنن الكبرى)(١٥٣٥)(٧ ١٤٦)و (٣ ٢١٤) . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح سنن ابن ماجة)(١٣٣١) وفي (المشكاة) (٣١٤٩) وفي (الكلام الطيب) (٢٠٥) . وانظر بتوسع في (خطبة الحاجة) (ص ١٤ -١٩) .

دراوسێدا ، لەگەڵ ڕوون کردنەوەی زیانەکانی خراپ ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێ دا . وە کۆتایی باسەکەم هێناوە بە چۆن ڕەفتار و مامەڵە کردن لەگەڵ دراوسێ بە هەموو جۆرەکانیەوە لە کۆتایدا لە خوای گەورە داواکارم کە باوەڕ و زانست و تێگەیشتنمان بۆ ئاینەکەی خۆی زیاد بکات وە سوودمان پێ بگەیەنێت بەو زانیاریانەی کە زانیومانە وە زیاتر حاڵیمان بکات لە ئاینەکەی خۆی (آمین) .

**باوکی عبدالله**

**محمد مەلا فایەق شارەزووری**

## پێناسەی دراوسێ :

١) **راغبی ئەصبهانی** (رحمه الله) **دەفەرموێت** :" دراوسێ ئەو کەسەیە کە لە تۆوە نزیك بێت ، بۆیە هەندێك جار بە برا و خێزان و خزم و پەنادراو و شەریك و سەرخەر و .... شتانی تر دەوترێت: دراوسێ"[٢]

٢) **ئیبن وحەجەری عەسقەلانی** (رحمه الله) **دەفەرموێت** :"دراوسێت ئەو کەسەیە کە لێت نزیك بێت گەر موسوڵمان بێت یان کافر ، چاکە کاربێت یان خراپەکار ، دۆست بێت یان دوژمن ، سوودمەند بێت یان زیان بەخش بێت ، خزم بێت یان بێگانە بێت ، شاری بێت یان لادێیی بێت، خانووەکەی لێتەوە دوور بێت یان نزیك"[٣]

سنووری دراوسێ لای زانایان جیاوازە : گێراوەتەوە لە ئیمامی عەلی یەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی :-"هەرکەسێك دەنگی تۆ بیگاتێ ئەوە دراوسێ یە" ، وە هەندێك فەرموویانە :-"هەرکەسێك بانگی گوێ لێ بێت ئەوە بە دراوسێ دەژمێرێت" [٤] وە بۆ زیاتر ئاشنابوون بەم باسە بڕوانە (مشكل الاثار)ی ئیمامی

---

[٢] انظر: (المفردات) ص١٠٣، و(لسان العرب) (٤ /١٥٣).(مختار الصحاح)(١١٦) .

[٣] انظر: (فتح الباري) (١٠ /٤٥٦) .

[٤] انظر:فتح الباري ١٠ /٤٥٦، و القرطبي ( تفسير) (٣ /٥ /١٨٥) ، ورواه ابو داود في بسند صحيح عن الزهري من قوله . انظر (تخريج احاديث احياء علوم الدين) برقم (١٨٤٤)

طەحاوی(٤/٢١) . وە سەبارەت بەم باسە حەسەنی بەصری دەفەرموێت :- "دراوسێ بریتی یە لە چل ماڵ لای ڕاست و لای چەپ و لای سەرو لای خوارەوە"[٥] .

## مافەکانی دراوسێ

### ١) چاك ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێ دا :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَٱعْبُدُوا ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴾ (النساء: ٣٦ ). واتە: تەنها خوای خۆتان بپەرستن و هاوتای بە هیچ جۆرێك بۆ بڕیار مەدەن و چاك ڕەفتار بکەن لەگەڵ باوکان و دایکانتاندا وە لەگەڵ دراوسێ ی خزمتاندا و هەروەها لەگەڵ دراوسێ ی بێگانە و هاوەڵان و هاوڕێ یانی ڕێگەتاندا[٦] .

---

[٥] اخرجه:البخاري في (الادب المفرد) (١٠٩).وحسن اسناده الشيخ الالباني في (صحيح ادب المفرد) برقم (٨٠)

[٦] انظر: تفسير الطبري (٤/١١١)و سنده حسن كما قال الحافظ في (فتح الباري)(١٠/٤٥٦) . وانظر:(تفسير) القرطبي (٣/٥/١٨٥) . و(زاد المسير)(٢/٣٥) . و(تفسير) ابن كثير (٢/٧٤).

پیاوێك لە (انصار) (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : لەگەڵ خێزانەکەمدا چووین بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و پێ ی گەیشتین و تەماشام کرد بە پێوە وەستاوە و پیاوێك ڕووی تێکردووە و قسەی لەگەڵ دەکات . گومانم وا بوو کە پێویستیەکی هەیە بە پێغەمبەر(ﷺ)، وە منیش دانیشتم . سوێند بەخوا ئەوەندە پێغەمبەر (ﷺ) بە پێوە وەستا لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەتا وام لێ هات بە زەییم دەهاتەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) بە هۆی زۆر وەستانیەوە، ئنجا ئەو پیاوە ڕۆیشت ،و منیش هەستام و چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێم ووت : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پیاوە ئەوەندەی وەستانیت هەتا وام لێ هات بەزەییم بە تۆدا دەهاتەوە بە هۆی زۆر وەستانتەوە ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : دەزانیت ئەوە کێ بوو ؟ ووتم : نەخێر ، فەرمووی : (( جبريل (عليه السلام) مازال يوصيني بالجار حتى ظننت أنَهُ سَيُوَرِّثَهُ أما إنكَ لو سَلَّمتَ عليه لرَّدَ عليك السلام )) ، واتە ئەو پیاوە جبریل بوو(عليه السلام) . لەو کاتەوە بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم کە لەگەڵ دراوسێکانمدا باشبم هەتا گومانم وابوو کەوای لێ دەکات کە میراتیش لەیەکتری ببەن . بەڵام ئەگەر سەلامت لێ بکردایە وەڵامی سەلامەکەی دەدایەوە[٧].

---

[٧] اخرجه: احمد (٥/ ٣٦٥) برقم (٢٠٣٥٠) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط :إسناده صحيح ، وقال المنذري في (الترغيب) (٣٧٨٢) : اسناده جيد . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب والترهيب) برقم (٢٥٧١).

ئیمامی موجاهید (رحمه الله) دەفەرموێت : لای عەبدولاَی کوڕی عەمری کوڕی عاص بووین(ﷺ) و خزمەتکارەکەی بزنێکی کەوڵ دەکرد ، عەبدولاَ پێی وووت :" کوڕم ئەگەر تەواو بوویت لە پێشدا بەشێك بنێرە بۆ دراوسێ جوولەکەکەمان ، لەو کاتەدا پیاوێك لە ئامادەبووان ووتی : بۆ جوولەکەی دەنێریت هەی خوا باشت بۆ بکات ؟ عەبدولاَش (ﷺ) فەرمووی : (( سمعتُ النَّبـيَ (ﷺ) يوصي بالجار حتى خشـينا او رؤينا أنَهُ سَيُوَرِّثُهُ )) واتە : گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری دەکردین کە باشبین بۆ دراوسێمان هەتا ترساین و وامان بینی کە وای لێ دەکات کە میراتیشمان لێ ببات "[٨].

٢ ) خواردن بردن بۆ دراوسێ و بەسەرکردنەوەی :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاری هاوەڵی خۆی کرد ئەبو ذەری غەفاری (ﷺ) پێی فەرموو :(( إذا طَبَختَ مَرقاً فأكثِر مائهُ ثُمَ انظُر أهلَ بيت مِن جيرانِكَ فأصِبهُم مِنها بمَعروف ))[٩] .وە لەڕیوایەتێکدا هاتووە

---

[٨] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١٣٨)، وابو داود (٥١٥٢)، والترمذي (٢٠٢٤) ، وصححه الشيخ الالباني في صحيح (الادب المفرد) برقم (٩٥)، و (الارواء)(٨٩١) ، و (صحيح ابو داورد) برقم (٤٢٩١).

[٩] اخرجه : مسلم (٢٦٢٥).

[وتعاهد جيرانك][١٠] ، وە لەڕیوایەتێكی تردا [فإِنَّهُ اوسَعُ لِلأَهلِ و الجيران][١١] .....)). واتە : ئەگەر شلەیەكت لێ نا ئاوی زۆر تێبكە ئنجا تەماشای خێزانی ماڵێك لە دراوسێكانت بكەو بە گوێرەی پێویست بە شیان بدە ، وە لەڕیوایەتێكدا [دراوسێكانت بەسەر بكەرەوە] ، وە لەڕیوایەتێكی تردا [ئاوی زۆر تێبكە تا بەشی خێزان و درلوسێكانت بكات] . ئەم باسەش لەبەر ئەوەیە چونكە دووكەڵ و بۆنی خواردنەكە دەگاتە نزیك ترین كەسەوە كە ئەویش دراوسێیە ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی كە منداڵانی دراوسێ داوای ئەو خواردنە بكەن و پێی دەچێت كە خاوەنەكەیان بێوەژن بێت یان هەژار بێت نەتوانێ ئەو خواردنە دەستەبەر بكات بۆ منداڵەكانی و دوا جار تووشی ئازار و ئەركی زیاتر ببێت[١٢] .

٣ ) نەرمی و گوێ ڕایەڵی كردنی دراوسێ :

دراوسێ بەهۆی زۆر نزیكیان لە یەكترەوە هەندێ جار بەشدار دەبن لە ڕێگەو بان و دیوار و گوێ سەبان و ڕاكێشانی هێڵی كارەبا و تەلەفون و بۆری ئاو و ئاوەڕۆ ...هتد. لەبەر ئەوە زۆر جار

---

(١٠) اخرجه : مسلم (١٤٢).

(١١) اخرجه : احمد (٥/١٥٦) . وابن الحبان (٥١٣) وقال محققه الشيخ الارناؤرط ....ه صحيح على شرط مسلم.

(١٢) انظر: (الجامع لاحكام القران) للقرطبي (٣/٥/١٨٥).

پێویستیان بە بەكارهێنانی سنووری یەكتر دەبێت سەبارەت بەم باسە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: ((لايمنع جارٌ جارهُ أن يغرزَ خشبَةً في جداره))[١٣] ، وە لەڕیوایەتێكدا: (( لا يمنَعُ أحدكم جاره أن يغرِز خشَبَةً على جِدارِهِ))[١٤].واتە: هیچ دراوسێیەك ڕێگە لە دراوسێكەی نەگرێت كە دار مێخێك بە دیوارەكەیدا بچەقێنێت وە لەڕیوایەتەكەی تردا دەفەرموێت : هیچ كەسێك لە ئێوە ڕێگە لە دراوسێكەی نەگرێت كە دارێك بكاتە سەر دیوارتان یاخود بیچەقێنێ و دایبكوتێت ، وە هەروەها ئەبوهورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) كە فەرموویەتی : (( اذا استأذنَ أحَدَكُم جارَهُ اَن يغرزَ خَشَبَةً في جِدارِهِ فَلا يَمنَعهُ))[١٥] واتە : ئەگەر یەكێك لە ئێوە دراوسێكەی داوای لێ كرد كە ڕێگەی بدات دار مێخێك بە دیوارەكەیدا بچەقێنێت با ڕێگەی بدات ولێی قەدەغە نەكات . كە وابوو دەركەوت كە ئەم جۆرە كارانە دەبێت بە ئاگاداری دراوسێكان بێت وە بە گوێرەی ڕەزامەندیان بێت وە ئەوانیش ڕێگە لەو ئاسانكاریانە لە دراوسێكانیان نەگرن ، ئەگەر

---

[١٣] اخرجه: احمد (٤/٤٦٣) . والبخاري (٢٤٦٣) . و مسلم (١٦٠٩) .

[١٤] اخرجه: ابن ماجة (٢٣٣٧) . و صححه الشيخ الالباني في (الصحيح ابن ماجة) (١٨٩٢) .

[١٥] اخرجه: ابن ماجة (٢٣٣٥) . وصححه الشيخ الالباني في (الارواء) (١٤٣٠) . و(صحيح ابن ماجة) (١٨٩٠) .

کار بکاتە ئەوەش کە پرسیان پێ نەکرا : یەحیای کوڕی جەعدە ئەفەرموێت : "پیاوێك لە مەدینە ویستی دارێك لەسەر دیواری دراوسێکەی دابنێ بەبێ پرس و ڕازی بوونی . ئەویش ڕێگەی لێ گرت، ئنجا هەر ئەنصاریەك دەچوو و دەیگێڕایەوە لای پێغەمبەری خواوە (ﷺ) کە ئەو کارەی قەدەغە کردووە ، تا ئەو دراوسێ یە ناچار کرا کە ڕازی ببێت" [١٦] لەبەر ئەمە لای (جمهوری) زانایان و ئیمامی طەبەری (رحمه الله) لە (تهذیب الاثار)دا (٧٩٦/١) ئەم بۆچوونە پەسەندە ، وەئەم دوو فەرموودەیەی لا خوارەوە ئەم بۆچوونە پەسەندتر و بەهێزتر دەکەن :

## فەرموودەی یەکەم :

((لیس للجار ان یمنع جارهُ أن یَضَعَ اعوادهُ في حائِطِهِ))[١٧] . وەلە ڕیوایەتێکدا لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه)کە فەرموویەتی : ((إنّ رسول الله (ﷺ) قضى أنّ الجار یَضَعُ جُذْعَهُ أوْ خَشَبَةَ في حائط جارهِ إن شاءَ وإن ابى))[١٨] واتە : دراوسێ بۆی نیە ڕێگە لە دراوسێکەی بگرێت کە دارەکانی یان کۆڵەکەکانی بکاتە ناو باخی دراوسێکەیەوە ،

---

[١٦] اخرجه : البيهقي في (الكبرى)(١١٥٧٠) ، وصحح اسناده الشيخ الالباني في (الصحيحة)(١٠٨٤/٦) .

[١٧] اخرجه البيهقي في (الكبرى) (١١٥٦٥) وقال اسناده صحيح .

[١٨] اخرجه البيهقي في (الكبرى)(١٢٠٨٠) ، وانظر حول الموضوع (تفسير القرطبي)(١٨٦/٥/٣) .

وەهەروەها ئەبوهورەیرە (ﷺ) دەفەرموێت : پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری لەسەر ئەوە داوە كە دراوسێ بۆی هەیە كۆڵەكەكانی یان دارەكەی بكاتە ناو [باخی یان دیواری] دراوسێكەی ئەگەر دراوسێكەی ڕێگە بدات یان ڕێگە نەدات .

## فەرموودەی دووەم :

((من بنى بناءً فَليدعَمهُ حائِطُ جارِهِ– وفي لفظ – :من سَألَهُ جارُهُ أن يَدعَمَ على حائِطِهِ فَليَدعَهُ))[١٩] ، واتە : هەر كەسێك دیوارێكی دروست كرد با لەسەر دیواری دراوسێ كەی ڕای بگرێت یاخود : هەر كەسێك دراوسێكەی داوای لێ كرد كە گوێسەبانەكەی یان سەقفەكەی لەسەر دیواری دراوسێ كەی ڕابگرێت با ڕێگەی بدات و لێی گەڕێت . (والله اعلم) .

**٤ ) زۆر چاكە كردن لەگەڵ دراوسێدا :**

پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێك كە زۆر باش بێت بۆ دراوسێكەی و چاكترین دراوسێ بێت بۆ ئەوانەی كە لێوەی نزیكن: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (( خير الاصحاب عند الله خيرهم

---

[١٩] اخرجه الطبري في (تهذيب الاثار)(١/٧٧٢) ، واحمد (١/٢٣٥) ، والطبراني في (الكبير)(١١٧٣٦)، وقال الشيخ الالباني في (الصحيحة)(٢٩٤٧) الحديث صحيح .

لصاحِبِهِ و خیر الجیران عند الله خیرهم لجارِهِ))[٢٠] واتە : چاكترین هاوڕێ لای خوای گەورە ئەو كەسەیە كە بۆ هاوڕێكانی خۆی باش بێت ، وە چاكترین دراوسێ لای خوای گەورە ئەو دراوسێیە كە زۆر باش بێت لەگەڵ دراوسێكانی خۆیدا . وەهەروەها لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت : ((من كان یؤمن بالله والیوم الاخر فَلْیُحسِن الی جارِهِ))[٢١] واتە : هەركەسێك باوەڕی بە خودا و ڕۆژی كۆتای هەیە با چاكە بكات لەگەڵ دراوسێكەیدا .

**٥ ) بەكەم نەزانینی دیاری دراوسێ :**

دراوسێ هەموو وەك یەك نین وە گوزەرانیان جیاوازە . هەندێكیان دەوڵەمەندن و هەندێكیان هەژارن . ئەگەر هەموو لە نێوان خۆیاندا خواردن ودیاری ببەخشن بەیەكتری . ئەوا بێگومان دیاری و خواردنی هەندێكیان باشتر دەبێت لەوەی تریان بەهۆی ئەوەی باری گوزەرانی هەموو یەكێك لەوان جیاوازە ، لەبەر ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری كردووین كە دیاری یەكتر بەكەم نەزانین، بەتایبەت ئامۆژگاری ئافرەتانی موسوڵمانانی كردووە چونكە

---

[٢٠] اخرجه احمد (٢/١٦٧) . والبخاري في (الادب المفرد)(١٥٠) . والترمذي (١٩٤٤) . والدارمي (٢/٢١٥) . والحاكم (١/١٦٤) . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد)(٨٤) ، و(الصحيحة)(١٠٣)، و(صحيح الترغيب والترهيب)(٢٥٦٨) .

[٢١] اخرجه: مسلم في (صحيحه (١٧٤)

دروست كردنی خواردن تایبەت مەندی خۆیانە و بگرە لە دروست كردنی خواردنەكەشدا زۆر جیاوازیان هەیە لەچاكی و خراپی و ڕازاندنەوەیدا ، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((یانساء المسلمات لاتَحقِرَنَّ جارةُ لِجارَتِها ولو فِرسَن شاةٍ))[٢٢] واتە : ئەی ئافرەتانی موسوڵمانان یەك لەئێوە بەكەمی نەزانێت كە دراوسێكەی شتێكی كەمی بۆ نارد ئەگەر سمی قاچی مەڕێك بێت ، یاخود ئەگەر ئێسقانێكی كەم گۆشت بێت[٢٣].

لە ڕیوایەتێكی تردا پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((یانساء المؤمنات لاتحقرنَّ اِمرأةٌ منكُنَ لِجارتِها ولو كُراعَ شاةٍ مُحرِقٍ))[٢٤] واتە : ئەی ئافرەتانی باوەڕداران ئافرەتێك لە ئێوە بەكەمی نەزانێت كە دراوسێكەی ئێسقانێكی كەم گۆشتی سووتاوی بۆ بكاتە دیاری[٢٥].

ئەم ئامۆژگاریەش هەردوولا دەگرێتەوە كەدیاریەكی كەم نرخی بێ كەڵكیش بەكەم نەزانن و بیكەینە دیاری بۆ یەكتری ، بەڵام زیاتر دیاری بۆ هێنراوە كە دەگرێتەوە . وە بەتایبەتیش پێغەمبەر

---

[٢٢] اخرجه: البخاري (٦٠١٧) . ومسلم (١٠٣٠) .

[٢٣] انظر : (النهاية) لابن الاثير (٤٢٩/٣) .

[٢٤] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١٢٢) . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) برقم (٩٠) .

[٢٥] انظر : (النهاية) لابن الاثير (٥٤٦/١٠) .

(ﷺ) مەبەستی ئافرەتانە کە پابەندی ئەم ئامۆژگاریە بین چونکە ئەوان زیاتر ئاسەواری ئەم کارە دەیانگرێتەوە و زۆرتر هەڵدەچن ، و ئەوانیش زۆر جار سەرچاوەی دروست بوونی رِق و خۆشەویستین لەناو هەموو خێزانەکاندا[٢٦].

٦ ) گەیاندنی دیاری بەدراوسێ نزیکەکان لە پێشدا :

دراوسێی نزیك زیاتر ئاگای لە دراوسێکەیەتی کە چی دەهێنێتەوە ناو ماڵ و چیان هەیە و زیاتر ئارەزووی بۆ دەبزوێ ، وە هەروەها ئەو زیاتر کەڵکی بۆ دراوسێ نزیکەکەی خۆی هەیە و باشتر ئاگاداری ماڵەکەی دەکات لەبەر ئەم هۆیانە پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاریمان دەکات کە دراوسێ نزیکەکانمان زیاتر مانیان بەسەرمانەوە دەبێت ، لە پێشدا هەموو چاکەیەکمان ئەوان زۆتر بگرێتەوە بەهۆی نزیك بوونی دەرگاکانیان لێمانەوە .

دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە (رضي الله عنها) پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کردو فەرمووی : ((إنَّ لي جارين فإلى أيهما أُهدي ؟ قال: " الى أقربهما منك بابا" – وفي رواية– [ فإن أقربها باباً أقربها جواراً

---

[٢٦] انظر: (فتح الباري) (١٠/٥٤٦) .

فإذا سبق أصدها فجب الذي سبق] ([٢٧]))[٢٨] واتە : دوو دراوسێم هەیە بۆ کامیان لە پێشدا دیاری بنێرم ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : بۆ ئەوەیان کە زیاتر دەرگاکەی لێتەوە نزیکە . چونکە ئەوەیان کە دەرگاکەی لێتەوە نزیکە ئەوەیان دراوسێیەتیەکەی لە تۆ وە نزیکە ترە . کامیان پێشتر بانگیان کرد بیت لە پێشدا وەڵامی ئەوەیان بدەرەوە.

### ٧) ئارام گرتن لەسەر ئازار و ناڕەحەتیەکانی دراوسێ :

خەڵکان جیاوازن لە بۆچوون و هەڵسوکەوت و حەز و ئارەزوو خوڕەوشت و شتی تر ، وە لەلایەکی ترەوە جیاوازن لە پابەندبوونیان بە ئاینەوە و ئاگاداربوون و چاودێری کردنیان بۆ مافی بەرامبەر ، وەهەروەها لە ڕووی ئاستی ووشیاری ژن و منداڵانیان وە ئەرك و مەینەتیان وەکەم و زۆری ئەندامەکانی خێزانەکانیان جیاوازی هەیە ، وە هەندێك لایەنی باشەی زیاترە و هەندێك لایەنی خراپە ، وە مرۆڤ ناچارە بژێت لەگەڵ ئەم هەموو جۆرە خەڵکە جیاوازەدا و مامەڵە و هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات ،

---

[٢٧] أخرجه : البخاري (٦٠٢٠) . و أبي داود (٣٧٥٦) . وأحمد (المسند) (٢٣٤٦٦) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط :اسناده حسن.

[٢٨] أخرجه: البخاري (٦٠٢٠) .

زۆر جاریش زۆرینەی خەڵكان باش نابن وەكو خوای گەورە كە دەفەرمونێت : ﴿ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَـٰرِهُونَ ۝٧٠ ﴾ (المؤمنون: ٧٠ ) وەهەروەها دەفەرمونێت : ﴿ ..... وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝١٨٧ ﴾ (الأعراف: ١٨٧) وەهەروەها دەفەرمونێت وەهەروەها دەفەرمونێت : ﴿ ..... وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ۝٢٤٣ ﴾ (البقرة: ٢٤٣) وەهەوەها دەفەرمونێت : ﴿ ..... وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَـٰسِقُونَ ۝٤٩ ﴾ (المائدة: ٤٩ ) وەهەروەها دەفەرمونێت : ﴿ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ۝١١٦ ﴾ (الأنعام: ١١٦) وەهەروەها دەفەمونێت : ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ وَهُمْ يَمْكُرُونَ ۝١٠٢ ﴾( يوسف: ١٠٢ ) واتە : زۆرینەی خەڵكان ڕاستیان پێ ناخۆشە و نەزانن و هەڵەكارن و باوەڕدار نین وپێ نەزانن ، وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمونێت: ((تجِدون الناسَ كإبل مِئةٍ ، لايَجِدَ الرَّجَلَ فيها راحلةً))[٢٩] واتە : دەبینین خەڵكان وەك سەد حوشترێك وان پیاو بەدەگمەن تاقە حوشترێكی زۆر باشی لە

---

[٢٩] اخرجه: مسلم (٦٤٤٦) ، والترمذي (٢٨٧٢) .

هەموو ڕوویەکەوە تێیدا بدۆزێتەوە[٣٠] ، کەواتە بوو دراوسێی زۆر باش لەهەموو ڕوویەکەوە زۆر کەمە بەڕێژەی (١٪) ئەگەر هەبێ وبێ کەم و کوڕی بێت ، چونکە زۆربەی خەڵکان هەڵەکارن وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((كُلُّ بني آدم خطاءٌ وخير الخطائين التوابون))[٣١].واتە: هەموو مرۆڤەکان هەڵەکارن وە باشترین هەڵەکارەکانیان تۆبە کارانیانن. لەبەر ئەوە موسوڵمان زۆر پێویستە ئارام گربێت لەسەر ئازاری خەڵکان بە گشتی و دراوسێ بەتایبەتی ، پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت : (( المؤمن الذى يُخالِط الناس و يَصبر على أذاهُم خيرٌ – في رواية – (أعظم أجراً) من الذى لا يُخالِطُ الناسَ و لايَصبر على اذاهُم))[٣٢] واتە : ئەو باوەڕدارەی کە تێکەڵی خەڵکی دەبێت و ئارام لە سەر ئازارەکانیان دەگرێت زۆر باشترە و پاداشتی گەورە ترە لەو باوەڕدارەی کە تێکەڵ بە خەڵکی نابێت و ئارام ناگرێت لەسەر ئازارەکانیان . بۆیە زۆر پێویستە موسوڵمان ئارامگر بێت لەسەر ئازاری دراوسێ کانی و پاداشتی گەورەش دەستەبەر دەکات لەسەر ئەم کارەی ، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ)

---

[٣٠] انظر:شرح الحديث في (شرح مسلم) للامام النووي (١٦/٣١٧) .

[٣١] اخرجه: احمد (٣/١٩٨) ، والترمذي (٢٠٥١) ، وابن ماجة (٤٢٥١) ، والدارمي (٢/٣٠٣) ، الحاكم (٤/٢٤٤) ، وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع)(٤٥١٥) .

[٣٢] اخرجه:احمد (٤٧/٧٢) (٢٢٠١٩) ، والطبراني (الطبير) (١١/١٥٥) ،و ابن ماجة (٤٠٢٢).

دەفەرموێت (( ثلاثة يُحِبُهُمُ اللهُ ....و الرَجلُ يكونُ لَهُ الجارُ ، يُؤذِيهِ جارَهُ، فَيَصبرُ على أذاهُ حتى يُفرِّقَ بَينَهُما مَوتَ أو ظعنً )) وفي رواية (( إن الله عز و جل يُحب ثلاثةَ .... و رَجُلٌ كان لَهُ جار سُوءِ يُؤذِيهِ فَيَصبر على اذاهُ حتى يَكفِيهِ الله أياهُ بحَياةٍ أو مَوتٍ ))[٣٢] واتە: سیان هەن خوای گەورە خۆشی دەوێن ... (لەوانە) پیاوێك دراوسێیەکی هەیە و ئازاری دەدات و ئەو ئارام دەگرێت لەسەر ئەو ئازارە هەتا مردن یان بارکردن لە یەکیان دوور دەخاتەوە .

لە ڕیوایەتەکەی تردا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((خوای گەورە سیانی خۆش دەوێت:....(وە لەوانە) پیاوێك دراوسێیەکی خراپی هەیە و ئازاری دەدات ، بەڵام ئەو ئارام دەگرێت لە سەر ئەو ئازارە ، هەتا خوای گەورە لە کۆڵی دەکاتەوە بە ژیان یاخود بە مردن )).

ئیمامی طەحاوی (رحمه الله) دەفەرموێت : هەر کەسێك بەو جۆرە ئارام بگرێت لە سەر ئازاری دراوسێکەی کەمافی ئەوەی هەیە ئازاری نەدات بەڵام ئەو لە مافی خۆی دەبورێت لە پێناوی خوادا و چاوەڕێی پاداشتی ئەو کارەی لە خوای گەورە دەکات وە مل کەچ

---

[٣٢] اخرجه : الحاكم (٢.٨٩) و صححه على شرط مسلم و وافقه الذهبي . و صححه الشيخ الألباني في (صحيح الترغيب و الترهيب) (٢٥٩٦).

و گوێ ڕایەڵە لەبەر ئەمانە خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش دەوێت[٣٤].

٨ ) خێر کردن بە دراوسێ لە پێشدا :

موسوڵمان پێویستە زۆر چاك ئاگای لە دراوسێی خۆی بێت ، وە ئەگەر هەر پێویستیەکیان هەبوو دەبێت دراوسێ نزیکەکان ئەو پێداویستیانە دەستە بەر بکەن . وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( إن الله يوصيكم بأمهاتكم ...ثم يوصيكم بأبائكم ثم يوصيكم بالأقرب فالأقرب ))[٣٥] واتە: خوای گەورە ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ دایکانتاندا باشبن ئنجا ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ باوکانتاندا باشبن ئنجا ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ نزیك و نزیکترەکانتاندا باش ببن. بۆیە باش وایە کە هەر خێرێك کرا لە پێشدا بۆ دراوسێ و نزیکەکان ببرێت ئەگەر هەژار بوون ئەوا بەخێر دەژمێرێت . وە ئەگەر دەوڵەمەند بوون ئەوا بەدیاری و چاکە دەژمێرێت ، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((لاتَحِلُ الصدقَة لِغَني الا لِخَمسة : لِغازٍ في سبيل الله أو لِعامل عَلَيها أو لِغارمٍ . أو لِرَجُلٍ اِشتَراها

---

[٣٣] انظر (مشكل الاثار) (١٨/٤) .

[٣٤] اخرجه : البخاري في ( الادب المفرد)(٦٠) . وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (١٦٦٦) و (صحيح الادب المفرد) (٤٤) .

بمالِه . او لِرَجُلٍ كان لَهُ جارُ مسكينُ فتصدق على المسكين فأهداها المسكينُ للغني))[٣٦] واتە : پارەی زەکات و خێر بۆ دەوڵەمەند ناشێت تەنها پێنج جۆریان نەبێت : بۆ یەکێك کە غەزا بکات لەپێناوی خوادا ، یاخود بۆ یەکێك کە سەرۆککاری کۆکردنەوەی زەکاتەکەی کردبێت ،یاخود بۆ یەکێك کە کڕی بێتیەوە بەپارەی خۆی . یاخود بۆ پیاوێك کە دراوسێیەکی هەژاری هەبێت و ئەو چاکەیەی پێبگەیەنێت ئەویش وەك دیاری بیبەخشێتە دەوڵەمەندێ . وە لە ڕاستیدا زەکات بۆ دراوسێی دەست کورت باشترە وە لە پێش ترە تا کەسانی دوور. عەکرمەی (ﷺ) دەفەرموێت : " تعطي زكاة مالكَ ذوي قرباك فأن لم يكونوا فموالِك فأن لم يكونوا فجيرانك " [٢٧].واتە: (زەکاتی ماڵەکەت بدە بە خزمانت . ئەگەر نەبوو بەخزمەتکارەکەت (واتە:بەندە و کەنیزەك) . ئەگەر نەبوو بە دراوسێکەت).

وە پیشینی پێشینە پیاوچاکەکانیش بەم جۆرە بوود : عوبەیدیلای کوڕی ئەل شومەیط دەفەرموێت :"ئافرەتێك هات بۆ لای حەسەنی بەصری و سکاڵای نەبوونی خۆی دەکرد و دەیووت

---

[٣٥] اخرجه:ابو داود (١٦٣٥) . و ابن ماجة (١٨٤١) . ابن خزيمة (٢٣٦٨) .وصححه الشيخ الالباني في(صحيح ابن ماجة) برقم (١٤٩١) . و (الارواء) (٨٧٠) . و (صحيح ابي داوود) (١٤٤٠) و(صحيح الجامع)(٧٢٥٠) .

[37] انظر : (المصنف) لعبد الرزاق برقم (٨١٤٩).

من دراوسێتم، حەسەنی بەصری (رحمه الله) فەرمووی : چەند ماڵ لێمانەوە دوریت ؟ ئەویش ووتی : حەوت ماڵ یان دە ماڵ ، حەسەنی بەصری (رحمه الله) تەماشای ژێر ڕاخەرەکەی کرد و بینی شەش یان حەوت درهەمی لێیە و بەخشیە ئافرەتەکە و ووتی : نزیك بوو تیابچین" (٣٨).

**٩ ) هاوکاری کردنی دراوسێ لە چاکەدا بەهەموو جۆرێك :**

دراوسێکان پێویستە هاوکاری یەکتر بکەن لە هەموو کارێکی خزمەت گوزاریدا و کار ئاسانی بۆ یەکتر بکەن ، لە دەستەبەر کردنی هەموو پێداویستیەکی گشتی وەك یارمەتی دانیان بە سپاردنی سەتڵ و پەیژەو پاچ و خاکەناز وپێداویستی ئاو و کارەبا، وبەدەمەوە چوونی دراوسێیەکی کارەسات بار و بەشداری کردن لە هەموو ئاهەنگ {تێبینی:ئەگەر ئەو ئاهەنگانە پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سەوننەت نەبن و ڕێگری شەرعیان لەبەردەم دانەبێت} و خۆشیەکدا وەك چوون بۆ پیرۆزبایی کردن و بەشداری کردنی دەعوەت و ناو نانی منداڵ و ئاهەنگی شایی و...هتد ...وەبەسەر کردنەوەی یەکتر بە هەموو کارێك کە لەتوانادا هەبێت:

---

(٣٨) اخرجه: ابن ابي الدنيا في (مكارم الاخلاق)(٣٣٤) . والمروزي في (البر والصلة) (٢٥٢) وقال محققه رجاله ثقات .

أ) دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە(رضي الله عنها) دەفەرموێت : ((والله اِن كُنا لننظر الهلال ثم الهلال ثم الهلال ثلاثة اهلةٍ في شهرين وما أُوقِدَ في ابيات رسول الله (ﷺ) نارٌ . [قالت عروة] قلت : ياخاله فما كان يُعيشُكُم؟ قالت : الاسودان التمر والماء اِلاّ اِنَّهُ قد كان لرسول الله (ﷺ) جيران من الانصار وكانت لهم منائح فكانوا يرسلون الى رسول الله من البانها فيسقيناه))[٣٩] واتە : وەڵاهی تەماشای مانگمان دەکرد دەهاتوو دەچوو لە سێ مانگدا و لە یەکێك لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئاگر نەدەکرایەوە: عروە فەرمووی : پورێ ئەی بەچی دەژیان ؟ عائیشە فەرمووی:بە دووانە ڕەشەکە (واتە:خورماو ئاو) لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەندێك دراوسێی هەبوو کە ئاژەڵی شیرداریان هەبوو وەلە شیرەکەی بۆ پێغەمبەریان(ﷺ) دەنارد و ئەویش بەشی ئێمەی لێ ئەدا.

ب) هاوەڵی بەڕێز عوسمانی کوڕی ئەبیل عاص (ﷺ) کۆمەڵێك بازرگانی لەبەردەستدا بوو دەڕۆیشتن بۆ خاکی هندستان و شارەکان کاتێ دەگەڕانەوە هەرشتێکیان بهێنایە عوسمان لەگەڵ دراوسێکانیدا بەشی دەکرد تادەگەیشتە دوورترین دراوسێی[٤٠].

[38] اخرجه: البخاري (٢٥٦٧) ، ومسلم (٢٩٧٢) .

[39] اخرجه: المروزي في (البر والصلة) (٢٥٤) وقال محققه اسناده حسن .

**١٠) ئازار نەدانی دراوسێ بەهەر جۆرێك بێت :**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت : ((مَنْ كانَ يُؤمنُ باللهِ واليوم الآخِرِ فَلا يُؤذِ جارهُ))[٤١] . واتە : هەرکەسێك باوەڕی بەخواو ڕۆژی کۆتایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدات .

ئیمامی غەزالی (رحمه الله) دەفەرموێت:" کورتەی مافەکانی دراوسێ ئەوەیە : دەبێت لە پێشدا سەلامی لێ بکات ، وە زۆر درێژە بە قسەکانی نەدات لەگەڵیدا ، وە زۆر پرسیاری بارودۆخی لێ نەکات ، وە سەردانی بکات لە نەخۆشیدا ، و هاوسۆزی خۆی لەگەڵدا دەرببڕێت ، و چاو لە کەم و کوڕیەکانی بپۆشێت ، و لەسەربانەوە تەماشای ناو خانووەکەی نەکات ، و شتی زیاد نەکاتە سەر دیوارەکەی ، و پلوسکی ئاوەڕۆ نەکاتە ناو ماڵەکەی ، وخۆڵ نەکاتە بەردەم خانووەکەی ، و ڕێگەی ناو ماڵی لێ نەگرێت و تەماشای نەکات تا بزانێت چی بۆ ناو ماڵ دەهێنێتەوە ، وەهەر نهێنیەکی دەرکەوت بیشارێتەوە ، وەئاگاداری خانووەکەی بکات کاتێك کەلەوێ نەبێت ، وەگوێ لە گفت و گۆکانی لە ناو ماڵیدا نەگرێت ، وە چاو لەخێزانەکەی بگرێتەوە (واتە:تەماشای نەکات)،

---

[٤١] اخرجه: البخاري (٦٤٧٥) ، ومسلم(٤٧) .

ونەرم بێت لەگەڵ منداڵەکانیدا، و سوودی کارەکانی دونیا و قیامەتی فێر بکات" [42].

وە نابێت دراوسێ خانووەکەی بەسەر خانووی دراوسێکەیدا بەرز بکاتەوە تاخۆر و هەوا نەگاتە ماڵی دراوسێکەی .

حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت : " نابێت دراوسێ خانووەکەی بەسەر خانووی دراوسێکەیدا بەرز بکاتەوە و ڕێگەی هەوای لێ بگرێت" [43] . وە ئەگەر خواردنێکی گران بەهای کڕی پێویستە بیشارێتەوە لە پێش چاوی منداڵەکانی دراوسێکەیدا .

سوفیانی ثەوری دەفەرموێت: ئەگەر شتێکت کڕی ویستت بەشی دراوسێ کەتی نەدەیت ئەوا بیشارەوە تانەزانن چیت پێ یە" [44] وەئەوەش بۆ ئەوەیە کەمنداڵەکەت نەیباتە دەرەوە و منداڵی دراوسێکەی بێ توڕە بکات ئەویش بکەوێتە وێزەی باوك و دایکی تا ئەو شتەی بۆ پەیدادەکەن .

وەهەروەها نابێت دراوسێ زیان بە دراوسێی خۆی بگەیەنێت بەوەی کە لەشەقام و کۆڵاندا و ڕێگەی لێ بگرێت یان لێی ناڕەحەت بکات ، یاخود خاشاك فڕێ بداتە بەردەم خانووەکەیان ، یاخود

---

[41] انظر: (احياء علوم الدين)(٢/٢١٣) . و(مختصر منهاج القاصدين )(ص:١٣٨ ) .

[42] اخرجه: المروزي في (كتاب البر والصلة)(٢٤٤) وقال محققه رجاله ثقات .

[43] انظر: (المطالب العالية) رقم (٢٧٥٧) . و (شعب الإيمان) للبيهقي (٩٥٦٠) .

دەنگی خۆی و دەنگی ڕادوێکەی و یاخود دەنگی سەیارەکەی یاخود هەندێك ئاژەڵ بەخێو بکات بە پاشە ڕۆکەکانیان یاخود بە دەنگیان ئازاری دراوسێ کانیان بدات وخەو وئارامیان لێ بشێوێنێت . وە نابێت ئاوەڕۆکەی لەبەردەم خانووەکەیەوە بە جۆگە بڕژێنێتە بەردەم کۆڵان و خانووی دراوسێکانی . وە نابێت کۆڵانیان لێ بگرێت و جاسوسیان بە سەرەوە بکات . وە نابێت هەموو کات بە بێ ئیزن بچێتە ناو خانووی دراوسێکانی . وە ئەو چۆنی پێ خۆشە کە دەراوسێکانی ڕەفتاری لەگەڵ دا بکەن دەبێت ئەویش هەروەها ڕەفتار لەگەل دراوسێکانی دا بکات . وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت (( و الذي نفسي بيده لايؤمنُ عبدٌ حتى يُحب لجاره ما يُحب لنفسه ))[٤٥] واتە : سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بەدەستە باوەڕی تەواو نیە ئەو بەندەیە هەتا ئەوەی بۆ نەفسی خۆی پێ ی خۆشە بۆ دراوسێ کەشی پێ ی خۆشبێت .

**١١ ) ڕێز گرتن لە دراوسێ بەهەموو جۆرێك :**

پێویستە لە سەر موسوڵمان کە ڕێز لە دراوسێکەی بگرێت . وە ڕێزگرتن زۆر شت دەگرێتەوە : ڕێز لە خۆی وە لە میوانەکانی وە لە خزم و دۆستانی وە لە ڕاوبۆچونی وە ڕێز لە منداڵ و

---

[٤٥] اخرجه بهذا اللفظ: مسلم (١٦٩).

خێزانەکەی . وە رێز لە پلەو پایەی . وە رێز لە هەموو بوارەکاندا.
پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فليكرم جاره )) [٤٦] واتە : هەر کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی کۆتایی هەیە با ڕێز لە دراوسێکەی بگرێت . واتە ئەگەر لە دینیشدا لەگەڵیدا جیاواز بوو.

وە پێویستە دراوسێی موسوڵمان پەیوەندی نێوان دراوسێکانی گەڕەك چاك بکات و ئەگەر دوو دراوسێ زویر بووبن لە یەکتری ئاشتیان بکاتەوە . وەك مافی دراوسێیەك ، وە بەدەست خستنی چاکەیەکی گەورە لای خوای گەورە وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((ألا أخبركم بأفضل من درجة الصيام و الصلاة و الصدقة؟ قالوا : بلى . قال : إصلاح ذات البين . فإن فساد ذات البين هي الحالقة [لا أقول تحلق الشعر و لكن تحلق الدين] )) [٤٧] واتە: ئایا پێتان ڕاگەیەنم بە باشتر لە پلەی ڕۆژو و نوێژ و خێر کردن ؟ ووتیان : بەڵێ ، فەرمووی : چاك کردنی پەیوەندی نێوان دوو کەس ، چونکە خراپ بوونی پەیوەندی نێوان دوو کەس ئەوە تاشەرە

---

[٤٦] اخرجه : أحمد (٢ ١٧٤) . والبيهقي في (الشعب) (٩٣٣٤) . و قال المنذري في (الترغيب) (٣٧٧٧) : إسناده حسن . و صححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٢٥٦) .

[٤٧] اخرجه : أحمد (٦/ ٤٤٤) . و أبو داود (٤٩١٩) . و الترمذي (٢٥٠٩) . و ابن حبان (٥٠٧٠) . و صححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب) (٢٨١٤) .

[ناڵێم قژ دەتاشێ بەڵکو ئاین دەتاشێ ] . وە پێویستە دراوسێی موسوڵمان ڕێز لە دەعوەتی دراوسێی خۆی بگرێ ، و بچێتە خانوەکەی و ئەو بانگ کردنەی قبوڵ بکات ، ئەگەر ڕێگرێکی شەرعی نەبێت بۆ ئەو چوونە ، چونکە قبوڵ کردنی دەعوەت زۆر پێویستە ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((من لم يُجب الدعوة فقد عصى الله و رسوله ))[٤٨] واتە: هەر کەسێك بانگ کرا بۆ نان خواردنێك و نەڕۆیشت سەرپێچی خوا و پێغەمبەری کردووە : وە هەروەها دەفەرموێت:((إذا دعا أحدكم أخاه فالْيُجِب عُرسا كان أو نحوه))[٤٩] و في رواية : ((إذا دُعيتم الى كراع فأجيبوا))[٥٠] واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە براکەی بانگی کرد بۆ نان خواردن با بڕوات. ئەگەر ئاهەنگی شایی بێت یان لەو شێوانە ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت : ئەگەر من بانگ بکرێم بۆ خواردنی پێشەیەك دەچم ، وە ئەگەر ئەو دەعوەتە دراوسێکە بە پارەی خێریش ئامادەی کردبێت پێویستە لەسەر ئەو دراوسێ بانگکراوانە کە بڕۆن بۆ ئەو نان خواردنە ، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( لاتَحِلُ الصدقة لغني اِلاّ لخَمسة ..... أو جار فقير يتصدق عليه فيُهدي لك أو

---

[٤٧] اخرجه : مسلم (١٤٣٢)

[٤٨] اخرجه :مسلم (١٤٢٩ . ١٠٠ . ١٠٤ ) . و ابو داود (٣٧٣٨) .

[٤٩] اخرجه: مسلم (١٠٤.١٠٠.١٤٢٩) . و ابوداود (٣٧٣٨) .

يَدعُوكَ))[٥١] .واتە : زەكات بۆ دەوڵەمەند ناشێت مەگەر بۆ پێنج كەس نەبێت {لەوانە} دراوسێیەكی هەژارە زەكاتی دەدرێتێ ئەویش بە دیاری بۆتی دەنێرێت بە دەعوەتی نان خواردن پێشكەشت دەكات .

بەریرە(رضي الله عنها) خانووەكەیان نزیك بوو لە ماڵی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وە ئافرەتێكی هەژار بوو ، جارێكیان هەندێ خێر و زەكاتیان بۆ نارد كەلەناویدا هەندێك گۆشت هەبوو ئەویش لەو گۆشتە بەشێكی نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) كە حەرام بوو لەسەری زەكات وخێر وەربگرێ . كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ویستی لەو گۆشتە بخوات . عائیشە (رضي الله عنها) فەرمووی : ((.... ولكنه لحمٌ تُصُدِق على بريرة فأهدتهَ لنا ؟ فقال رسول الله (ﷺ) : ((هو صدقةٌ عليها وهديةٌ لنا))[٥٢] ، واتە : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو گۆشتە هی خێرە دراوە بە بەریرە ئەویش هەندێكی لێ ناردووە بۆمان ! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : بۆ ئەو خێرە لەویشەوە بۆ ئێمە دیارییە .

جارێكیان ئیبن مەسعود (رضي الله عنه) پیاوێك هات بۆلای وپێی ووت : من دراوسێیەكی سووخۆرم هەیە ، وزۆر جار دەعوەتم دەكات

---

[٥١] اخرجه: مسلم (١٤٣٢)

[٥٢] اخرجه: البخاري (٥٤٣٠) .

ئەویش فەرمووی ((مَهنَأهُ لك وإثمُهُ عليه))[٥٣] واتە : دەعوەتەكەی قبووڵ بكەن ، خواردنەكەی بۆ ئێوەیە و تاوانی چۆنێتی پەیدا كردنەكەی لە گەردنی خۆیەتی .

وەهەروەها ئەم بەسەرهاتەش لە حەسەنی بەصری (رحمه الله) پرسیار كراوە: "وروي ذلك عن الحسن البصري ايضاً: حينما سأله رجل عن الجارِ له عريف (أي : جاسوس الحاكم) يهدي إليه أفيقبل هديته أو يولم فيدعوه افيجيبُ دعوته .فأجابهُ الحسن البصري يقوله : ( نعم لك مَنوها و عليه وزُرها)) [٥٤]. واتە: پیاوێك پرسیاری لە حەسەنی بەصری كرد و ووتی : من دراوسێیەكەم هەیە سیخوڕی كار بە دەستی گەورەی ئەو شوێنەیە دیاریم بۆ دەنێرێت ئایا وەری بگرم؟ یاخود بانگم دەكات بۆ نان خواردن،ئایا بچم بۆ ئەو دەعوەتە؟حەسەنی بەصری فەرمووی: بەڵێ خواردنەكە بۆ تۆیە چۆنێتی پەیداكردنەكەی لەگەردنی خۆیەتی. بەڵام ئەم كارەش جێبەجێ دەكرێت بە مەرجێك سوود و بەرژەوەندی یەكانی ئیسلام و موسوڵمانانی تێدا زۆر تربێت لە زیانەكانی. وەهەر لەباسی ڕێزگرتن لە دراوسێ دەبێت ئەوە بزانین كە ئەوە ڕێزگرتنە لابردنی ناڕەحەتیش بەسەر

---

[٥٣] اخرجه: عبد الرزاق في (المصنف)(١٤٦٧٥-١٤٦٧٦) ، وقال الشيخ الارناؤوط في تحقيق (جامع العلوم والحكم)(٢٠١/١) اسناده صحيح .

[٥٤] انظر : (شرح السنة) للإمام البغوي (١٥/٨).

دراوسێ وە دەگرێتەوە: مالیك (ﷺ) جارێکیان هەندێك دراوسێکانی دەست بەسەر کرابوون ئەویش هات بۆ لای معاویەی برای وپێ ی ووت : معاویە موحەمەد (ﷺ) هەندێك لە دراوسێکانی منی دەست بەسەر کردووە برۆ بۆلای چونکە ئەو تۆ دەناسێت و قسەی لەگەڵ کردوویت . معاویەش چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی: دراوسێکانمان بۆ بەربدە چونکە ئەوان پێشتر موسوڵمان بوونە ..... پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ((أرسلوا له جيرانهُ))[٥٥] واتە : دراوسێکانی بۆ بنێرنەوە و ئازادیان بکەن .

١٢ ) دراوسێ لە پێشترە بۆ کڕینەوەی سامانی دراوسێکەی :

ئەگەر دراوسێ ویستی فرۆشتنی خانووەکەی یان زەویەکەی هەبوو پێویستە لەپێشدا پرس بەدراوسێکانی بکات تا بزانێت نیازی کڕینی ئەو سامانەیان هەیە یان نا چونکە ئەوان شایستەترن ولە پێشترن ، ئەم مافەش لەشەرعدا پێ ی دەوترێت مافی (الشُفعة) ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((جار الدار

[٥٥] اخرجه: احمد (٤/٤٤٧) برقم (٢٠٠١٤) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط : اسناده حسن . والحاكم (٣/٦٤٩) . وقال الشيخ مقبل في(الجامع الصحيح مما ليس في الصحيحين)(٥ ٢٠٧) هذا حديث صحيح.

أحقُ بدار الجار))[٥٦].واتە : دراوسێی خانوو شایستەتر کە خانووی دراوسێکەی بکڕێتەوە ، بەڵام ئەم باسە زیاتر تایبەتە بەو سامانەی کە شەریکی یە لەناو چەند کەسانێکدا . وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((من کان له شریك في ربعةٍ أو نخلٍ فليس له أن يبيع حتى يُؤذِن شريكه ، فَإنْ رضيَ أخذَ ، وإن كَرِهَ تركَ))[٥٧] واتە : هەر کەسێك شەریکی هەبوو لە زەویەکدا یان لەباخە خورمایەکدا ئەوە بۆی نیە بیفرۆشێت هەتا شەریکەکەی ئاگادار نەکاتەوە ئەگەر ڕازی بوو ئەوا دەیکڕێتەوە وەئەگەر نەیویست ئەوا وازی لێ دەهێنێت . وەلە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت : ((الجارُ أَحَقُّ بِشُفعةِ جارِهِ يُنتَظَر بها وإن كان غائباً إذا كان طريقهما واحد))[٥٨] واتە : دراوسێ شایستەترە بۆ کڕینەوەی سامانی دراوسێکەی ئەگەر لەوێش ئامادە نەبێت پێویستە چاوەڕوانی ڕەزامەندی بکرێت بەمەرجێك ڕێگەیان یەك بێت .

وە لەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت : ((الشُفعَةُ فيما لَم يُقَسَم ، فإذا وقعتِ الحدود وصُرِفَتِ الطُّرُقُ فلا

---

[٥٦] اخرجه: الطحاوي في (شرح معاني الاثار)(٤ ١٢٢) . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع)(٣٠٨٩) .

[٥٧] اخرجه: احمد (٣ ٣١٢) .ومسلم (١٦٠٨) . وابن حبان (٥١٧٩) وقال محققه :اسناده صحيح .

[٥٨] اخرجه: احمد (٣ ٣٠٣) .والدارمي (٢ ٢٧٣) .وابو داود (٣٥١٨) . وصححه الشيخ الالباني في (الارواء)(١٥٤٠) . (صحيح الجامع)(٣١٠٣) .

شُفعَةَ))[٥٩] واتە : ماف (الشفعە) لەهەموو سامانێكدا دەبێت كەبەش نەكرێت ئەگەر توانرا بەش بكرێت و سنوور و ڕێگەی جیابكرێتەوە ئەوە مافی (الشفعة)ی تیانیە .

ئیمامی بەغەوی (رحمه الله) دەفەرموێت : ((زانایان كۆن لەسەر ئەوەی كە (الشفعە) پێویستە بۆ شەریك لە هەموو بەرهەم و سودێكدا كە توانای دابەش بوونی هەبێت ، وە زۆربەی شارەزایانی صەحابەو تابیعی لەسەر ئەوەن كە (الشفعە) بۆ شەریكە نەك دراوسێ ، بەڵام هەندێك زانایان وەك سوفیانی ثەوری و عەبدوڵای كوڕی موبارەك مافی (الشفعە) بۆ هەموو دراوسێ یەك دەزانن))[٦٠] .

## ١٣) پارێزگاری كردن لە دراوسێی بە هەموو جۆرێك :

پێغەمبەر خوا (ﷺ) دەفەرموێت : (( ...من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فليحفظ جاره.....))[٦١]. واتە: هەر كەسێك باوەڕی بە خواو ڕۆژی كۆتایی هەیە پارێزگاری لە خانوو كەل و پەل و منداڵ و ڕێزی دراوسێكەی بكات بە هەموو جۆرە پارێزگاری كردنێك ،

---

[٥٨] اخرجه: ابن ماجة (٢٤٩٧) ، والبيهقي(٦ ١٠٣) ، وابن حبان(٥١٨٥) وقال محققه :حديث صحيح .

[٥٩] انظر: (شرح السنة)(٨/ ٢٤١) .

[٦١] اخرجه : أحمد (المسند) (٦٦٢١) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط :اسناده صحيح لغيره.

وەبگرە ئەگەر نەخۆش کەوت پێویستە سەردانی بکرێت ئەگەر خورەوشتی جوان بوو هەرچەندە موسوڵمانیش نەبێت. ئیبن و نەبی حسێن (رحمه الله) دەفەرموێت : " إن النبي (ﷺ) كان له جار يهودي لابأس بخلقه فمرض فعاده رسول الله (ﷺ) بأصحابه"[٦٢] . واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دراوسێیەکی جوولەکەی هەبوو خورەوشتی خراپ نەبوو نەخۆشکەوت. پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵ چەند هاورێیەکیدا چوون سەردانیان کرد.

---

[٦٢] انظر: (المصنف) لعبالرزاق برقم (٩٩١٩، ١٩٢١٩).

# سوودەکانی چاك ڕەفتارکردن لەگەڵ دراوسێدا

**١) چاك ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا نیشانەی موسوڵمانی پێ گەیشتوی تەواوە :**

**پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری ئەبو هورەیرەی کردو فەرمووی :** ((یا أبا هريرة كُن ورِعاً تكن أعبد الناس . وكن قنِعاً تكن أشكَر الناس . و أحب للناس ما تحب لنفسك تكن مؤمناً . وأحسن مجاورة من جاورك تكن مسلماً – في رواية ( مؤمناً ) ))[٦٣] **.واتە : ئەی ئەبو هورەیرە خۆت لە حەرام بپارێزە خوا پەرسترین خەڵکان دەبێت . و ڕازی بەو بەشەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووی دەبێت بە سوپاس کار ترین خەڵکان، و ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ خەڵکانیشت پێت خۆش بێت دەبێت بە باوەڕدار . و چاك ڕەفتار بکە لەگەڵ دراوسێکەدا و ئەوەی لێتەوە نزیکە دەبێت بە موسوڵمان – لە ڕیوایەتێکدا : دەبێت بە باوەڕدار . شێخ محەمەدی کوڕی ئەبی حەمزە (رحمه الله) دەفەرموێت : (چاك ڕەفتار کردن لە گەڵ دراوسێ دا نیشانەی باوەڕداری کاملە )**[٦٤] .

---

[٦٣] اخرجه : أحمد (٢ . ٣١٠ ) . و ابن ماجة (٤٢١٧) . و البيهقي (شعب الايمان ) (٩٥٤٣) . و صححه الشيخ الألباني في ( صحيح الترغيب ) (١٧٤١. ٢٥٦٧) .

[٦٤] انظر : (فتح الباري ) (١٠ . ٤٥٦) .

**٢) ئەو كەسەی ڕەفتاری چاك بێت لە گەڵ دراوسێدا دەبێتە خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەكەی (ﷺ) :**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:** (( إن كنتم تحبون أن يحبكم الله و رسوله فحافظوا على ثلاث خصال : صدق الحديث و اداء الامانة و حسن الجوار ))[٦٥] **واتە: ئەگەر پێتان خۆشە خوا و پێغەمبەر خۆشی بوێن ئاگاداری سێ شت بن : ڕاست گۆیی . و دەست پاكی. و چاك ڕەفتار كردن لە گەڵ دراوسێدا .**

**لە ڕیوایەتێكی تردا دەفەرموێت :** (( من أحب أن يحبه الله و رسوله فليصدق الحديث و ليؤد الأمانة و لا يؤذي جاره ))[٦٦] .

**واتە : هەر كەسێك پێی خۆشە كە خوا و پێغەمبەرەكەی خۆشیان بوێ با ڕاست گۆ بێت و دەست پاك بێت و ئازاری دراوسێكەی نەدا .**

---

[٦٥] اخرجه : عبد الرزاق (١٩٧٤٨) ، و الطبراني في (الاوسط) (١ / ١٥٢) ، و حسنه الشيخ الالباني في (الصحيحة) (٢٩٩٨) .

[٦٦] اخرجه : البيهقي في (الشعب) (٩٥٥١) .

**٣) چاك ڕەفتار کردن لە گەڵ دراوسێدا هۆکاری خۆش گوزەرانی و تەمەن درێژی یە:**

موسوڵمان ئەگەر لەگەڵ دراوسێکەیدا چاك ڕەفتار بکات ئەوا تەمەن درێژ دەبێت بە مانای ئەوەی خوا بەرەکەت دەخاتە ناو کارەکانیەوە و لە ماوەیەکی کەمدا کاری گەورەی ئەنجام دەدات و تەمەنێکی پڕ شادی و کامەرانی بە سەر دەبات نەك بە مانای ئەوەی کە تەمەنی زیاتر بێت لەو تەمەنەی کە خوای گەورە لە (لوح المحفوظ)دا بۆی دیاری کردووە . و بەرەکەت دەکەوێتە ڕزقیەوە و بە پارەیەکی کەم خوای گەورە کاری گەورەی بۆ ڕێك دەخات کە بۆ کەسانی تر بە بوجەی گەورە ڕێك دەکەوێت. و ئەو کەسە دڵ دەوڵەمەند دەکات دووری دەکات و لە ئاخ و حەسرەت و حەسودی و چروکی نەك بە مانای ئەوەی کە ڕزقی زیاتر دەبێت لەو ڕادەیەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردووە . پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :((صلة الرحم و حُسن الخلق و حُسن الجوار يُعمران الديار و يزيدان في الأعمار ))[٦٧] واتە: (پەیوەندی خزمایەتی و خورەوشت جوانی و چاك ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا دەبنە هۆی ئاوەدانی ماڵان و تەمەن زیاد کردن) . بە تایبەت چاك ڕەفتار

---

[٦٧] اخرجه احمد (٦ ، ١٥٩) . و صححه الشيخ مقبل (رحمه الله) في (الجامع الصحيح ) (٥ ٢٠٦).

کردن لەگەڵ دراوسێدا ئەگەر خزم بێت و خوڕەوشت جوانی لەگەڵیدا هەر سێ باسەکە دەگرێتە خۆ ، بۆیە جەعفەری کوڕی موحەمەد ﷺ بە تایبەتی سەبارەت بەم باسە دەڵێت: "حُسن الجوار عمارة الديار "[٦٨] واتە :(چاك ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا دەبێتە ماڵ ئاوەدانی بۆ خاوەنەکەی) .

**٤) چاك ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا دەبێتە هۆی بەختەوەری خاوەنەکەی :**

موسوڵمان ئەگەر چاك بوو بۆ دراوسێی خۆی ئەوا دراوسێ باشەکانی زۆر بۆی باش دەبن و ئەم کارەش دەبێتە مایەی بەختەوەری و کامەرانی بۆ خاوەنەکەی ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((أربَعٌ من السعادة : المرأة الصالحة . والمسكن الواسع . والجار الصالح . والمركب الهنيء . وأربعٌ من شقاء : الجار السوء . والمرأة السوء ، والمسكن الضيق . والمركب السوء)) واتە : چوار شت مایەی بەختەوەرییە : ژنی باش ، وخانووی فراوان ، ودراوسێی باش ، وسواربووی ماندوونەکەر[٦٩](واتە: ولاغ وسەیارەی زۆر باش) ،

---

[٦٧] انظر: (عيون الاخبار) ( ٣ /٢٩) . و (المجالسة) للدينوري (١٠٩٠) .

[٦٨] انظر: (النهاية) لابن البر(٥ /٢٧٧) .

وچوار شت مایەی خەم و پەژارەیە : دراوسێی خراپ ، وژنی خراپ ، وخانووی تەسك ، ، وسورابووی خراپی ماندووكەر .

ح حەسەنی بەصری (رحمه الله) دەفەرموێت : لوقمانی حەكیم ئامۆژگاری كوڕەكەی كرد و پێی ووت : (كوڕی خۆم بەردم هەڵگرتووە وئاسن و شتی قورسیش بەلاَم هیچم نەدیوە قورس تربێت لەدراوسێی خراپ)[٧٠].

**٥) هەموو چاك رەفتار كردنێك لەگەڵ دراوسێدا بە خێر و صەدەقە دەنوسرێت بۆ خاوەنەكەی :**

هەموو چاكەیەك ئەگەر زەردەخەنەیەكیش بێت یان دڵخۆش كردنێك بێت یان بە سەركردنەوەیەك بێت بە خێر بۆ خاوەنەكەی تۆمار دەكرێت وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت:((كُل معروف صدقة ... و إن منَ المعروف ِأن تلقى أخاك و وجهكَ إليه منبَسِط ، وأن تَصُبَ مِن دلوك في إناء جاركَ ))[٧١] واتە : هەموو چاكەیەك بە خێر دەنوسرێت وە لە چاكەكردن ئەوەیە كە بە ڕوویەكی گەشەوە بگەیت بە براكەت ، یاخود لە ئاوی سەتڵەكەت بكەیتە ئاوی

---

(٦٩) انظر:ابن ابي شيبة (١٦١٤٣) ، والبيهقي (الشعب)(٩٥٥٥) . والمروزي في (كتاب البر والصلة) (٢٢٥) وقال محققه :اسناده حسنٌ لغيره .

(٧٠) اخرجه : أحمد ( ٣ / ٣٦٠ ) ، و الترمذي (١٩٧٠) ، و حسنه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع) (٤٥٥٧) .

سەتڵی دراوسێکەت ، وە ئەگەر ئەو دراوسێیە دەوڵەمەند بێت یان هەژار هەر بە خێر و صەدەقە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێت) ، وەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :

(( كلُ معروفٍ صنعتَه إلى غنيٍ أو فقيرٍ فهو صدقة))[٧٢] واتە : (هەموو چاکە کردنێك بە خێر و صەدەقە دەنوسرێت ئەگەر لەگەڵ دەوڵەمەند دا ئەنجامت دابێت یان لەگەڵ هەژاردا).

ـ وە لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت : (( ...أحبُ الاعمالِ إلى اللهِ عز وجل سرورٌ تُدخِلُهُ على مسلم : تكشِف عنه كُربةً أو تقضي عنه ديناً و تطرد عنه جوعاً ))[٧٣].

واتە : (خۆشەویست ترینی کارەکان لای خوای گەورە : خۆشی یەکە کە دەیکەیتە دڵی موسوڵمانێکەوە : ناڕەحەتیەکی بەسەرەوە لادەبەیت یان قەرزێکی بۆ دەدەیتەوە یان برسێتیەکی لێ دەڕەوێنیتەوە) .

---

(٧٢) اخرجه : الطبراني في (الاوسط ) و الكبير ( ٣/٦٢ ) . و ابو نعيم في (الحلية ) (٣/٤٩) . و صححه الشيخ الالباني رحمه الله في (الصحيحة ) (٢٠٤٠) . و (صحيح الجامع) (٤٥٥٨) .

(٧٣) اخرجه الاصفهاني في (الترغيب ) (١١٣٥) . و ابن ابي الدنيا في (قضاء الحوائج ) (ص: ٤٥) . و حسنه الشيخ الالباني في( صحيح الترغيب ) (٢٦٢٣) . و الصحيحة (٩٠٦) . و (صحيح الجامع ) (١٧٦) .

**٦) شایەتی دراوسێ بۆ دراوسێکەی خۆی لای خوای گەورە وەردەگیرێت :**

**عەبدوڵای کوڕی مەسعود (ﷺ) دەفەرموێت: پیاوێك بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت : من چۆن بزانم کە چاکە کارم یان خراپە کارم ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ((** إذا سَمِعتَ جيرانكَ يقولون : انْ قد أحسنت ، فقد أحسنتْ ، وإذا سَمِعتَهُم يقولون ( إنكَ) قد أسأتَ ، فقد أسأت **))[٧٤] . واتە: (ئەگەر گوێت لێ بوو دراوسێکانت دەیان ووت : تۆ چاکەت کردووە و چاکە کاریت ، ئەوا تۆ چاکە کاریت ، وە ئەگەر گوێت لێ بوو دەیان ووت : تۆ خراپەت کردووە و خراپەکاریت ، ئەوە تۆ خراپە کاریت).**

**وە هەروەها ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((**ما من مسلمٍ يموت فيَشهدُ لهُ أربعةٌ من أهل ابيات جيرانهِ الأدنينْ أنهم لا يعلمون مِنه إلا خيراً ، إلا قال الله تبارك و تعالى : قد قبلتُ قولكم أو قال بشهادتكم و غفرتُ لهُ ما لا تعلمون **))[٧٥] واتە : (هەر موسوڵمانێك بمرێت و چوار لە دراوسێ نزیکەکانی شایەتی بۆ بدەن کە ئەوان تەنها چاکەکردن نەبێت**

---

[٧٣] اخرجه : أبن ماجة (٤٢٢٢ - ٤٢٢٣ ) ، و صححه الشيخ الالباني في (صحيح أبن ماجه ) (٣٤٠١- ٣٤٠٢ ) ، و (الصحيحة) (١٣٢٧) ، و المشكاة (٤٩٨٨) .

[٧٤] اخرجه : الحاكم (١٣٤٨) ، و ابن حبان (٣٠٢٦) و قال محققه صحيح ،و صححه الشيخ الالباني في (احكام الجنائز) (ص :٦١) .

نەیان زانیوە ( واتە : تەنها چاکە کردنیان لێ بینیوە و هیچ شتێکی خراپیان لێ نەدیوە ) ئەو جار خوای گەورە دەفەرموێت : ووتە و شایەتیەکانی ئێوەم بۆ ئەو پیاوە وەرگرت و لەو گوناهانەشی خۆش بووم کە ئەنجامی داوە و ئێوە پێتان نەزانیوە) . کەوابوو هەر کەسێك دراوسێیەکی چاکی شایەتی باشی بۆ بدات ئەوا بۆی قبوڵ دەکرێت چونکە باوەڕداران شایەتی دەرانی خوای گەورەن لە زەویدا و هەر کەسێك ئەوان شایەتی چاکی بۆ بدەن بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت . بەڵام دەبێت بزانین شایەتی دراوسێی خراپ کارو زۆر تاوانبار دژ بەباوەڕدار وەرناگیرێت[٧٦]. وەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ...... وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ ﴾ (النساء ١٤١) و﴿ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴿٧١﴾ ﴾ (التوبة ٧١).

- هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((من اثنيتم عليه خيراً وجبت له الجنة . و من اثنيتم عليه شراً وجبت له النار ) [الملائكة شهداء الله في السماء . و المؤمنون شهداء الله في الارض ] ))[٧٧] واتە: (هەر کەسێك ئێوە شایەتی باشی بۆ بدەن بەهەشتی بۆ مسۆگەر بوود

---

[٧٦] أنظر حول المسألة : (فتح الباري) (٣/ ٢٣) .

[٧٧] اخرجه : البخاري (٣٦٧) . و مسلم( ٩٤٩) . و النسائي (١/ ٢٧٣) . و احمد (٣/ ١٧٩). و الترمذي (١٠٥٨) . و ابن ماجه (١٤٩٢) . و انظر (احكام الجنائز )(ص: ٦٠ ) للشيخ الالباني .

وە هەر کەسێك ئێوە شایەتی بۆ بدەن دۆزەخی بۆ مسۆگەر بووە) . فریشتەکان شایەتی دەرانی خوای گەورەن لە ئاسمان و . باوەڕداران شایەتی دەرانی خوای گەورەن لە زەوی دا.

ئەبو زوهەیری سەقەفی (ﷺ) دەفەرموێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ووتاری بۆ داین و فەرمووی : ((یوشِكُ أن تعرفوا اهل الجنة من أهل النار)) واتە : نزیکە خەڵکانی بەهەشتی بناسنەوە و جیایان بکەنەوە لە خەڵکانی دۆزەخی ووتیان : بەچی ئەوە دەناسینەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : ((بالثناء الحسن والثناء السئ انتم شُهداء الله بعضكم على بعض))[78] واتە:(بەباس کردنی چاکە و بەباس کردنی خراپە ئێوە شایەتی دەرانی خوای گەورەن هەندێکتان لەسەر هەندێکتان) . (واتە : شایەتی باوەڕداران لەناو خۆیاندا بۆ یەکتری وەردەگیرێ و قبوڵ دەبێت).

## ٧) چاك ڕفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا بەهەشت بۆ خاوەنەکەی مسۆگەر دەکات :

پێغەمبەری خوا (ﷺ) مژدەی بەهەشتی داوە بەو کەسەی کە ئازاری دراوسێکەی نەدات ئەگەر چی عیبادەتیشی کەم بێت : ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەفەرموێت : (قال رجل یارسول الله إنَّ فلانة یُذكر

(٧٨) اخرجه: ابن ماجة (٤٢٢١) . وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح ابن ماجة)(٣٤٠٠) .

من قلة صيامها وصلاتها وانها تتصدقُ بالاثوار من الاقط ولاتُؤذي جيرانها قال[هي في الجنة])[٧٩] واتە : پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فلان ئافرەت کەم نوێژ و ڕۆژووە و پارچەی کەم کەم لە پەنیر ددکات بە خێر بەلام ئازاری دراوسێکانی نادات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ((ئەو ئافرەتە لە بەهەشتدایە )) .

## زیانەکانی خراپ ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا

١- خراپ ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێدا سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرد (ﷺ) :

خوای گەورە سنوری هەموو هەڵسوکەوت و مامەڵەیەکی بۆ دیاری کردووین هەر کەسێك ئەو سنورە ببەزێنێت ئەوە مافی خوا و پێغەمبەری (ﷺ) پێشێل کردووە . خوای گەورە ددفەرموێت :

﴿ ..... تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴾ (البقرة: ٢٢٩) واتە: (ئەوە سنوردکانە کە خوا بۆی دیاری کردوون مەی بەزێنن و لێ ی دەرمەچن وە هەر کەسێك وا بکات ئەوە لە

---

[٧٩] اخرجه احمد (٢ ٤٤) . والبخاري في (الادب المفرد)(١٢٠) . والبزار(١٩٠٢) . وابن حبان (٥٧٦٤) . والحاكم (٤ ١٦٦) .وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الترغيب)(٢٥٦٠) .وصحيح (الادب المفرد)(٨٨) .و(الصحيحة)(١٩٠) .

ستەم کارەکانە)؛ هەروەها دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَـٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ (النساء: ١٤ ) .واتە :(هەر کەسێك سەرپێچی خوا و پێغەمبەر بکات و سنورەکانی خوا ببەزێنێت خوای گەورە دەیکاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە هەتا هەتایی تیایدا دەمێنێتەوە و سزای سەر شۆڕ کەری دەدرێت) .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((لا قليل من اذى الجار ))[٨٠]
واتە : (کەمترین ئازاری دراوسێ دروست نیە) . وە پێویستە لە سەر موسوڵمانیش ئەم فەرمانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشێل نەکات چونکە تووشی سزای سەخت دێت خوای گەورە دەفەرموێت :

﴿ ...... فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (النور: ٦٣ ) واتە : (با باش ئاگایان لە خۆیان بێت ئەو کەسانەی سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن کە تووشی لادان لە ئاین دێن و توشی سزایەکی پڕ ئازار دەبن).

---

[٧٩] اخرجه : ابن ابي شيبة (٢٥٤١٤) ، و الطبراني (الكبير) (٢٣ :٢٥٨) ، و قال الهيثمي في (المجمع) (١٣٥٦٩)؛ رواه الطبراني و رجاله ثقات. وحسنه الشيخ علي الحلبي في (رسالة حقوق الجار) (ص:٢٥).

**٢) ئازاردانی دراوسێ وخراپ ڕەفتار کردن لەگەڵیدا نیشانەی کاڵبوونەوەی باوەڕە :**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :** ((من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فلا يؤذ جاره))[٨١] **واتە : (هەرکەسێك باوەڕی تەواوی هەیە بە ڕۆژی کۆتایی با ئازاری دراوسێکەی نەدات). کەوابوو هەرکەسێك کەم و کوڕی لە باوەڕیدا هەبێت ئەم کارە ناپەسەندە ئەنجام دەدات و ڕەفتاری خراپ دەبێت لەگەڵ دراوسێکانیدا ، ئەم ڕاستی یە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سێ فەرموودەدا دووپاتی کردۆتەوە :**

**١-پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت :** ((والله لايؤمن والله لايؤمن والله لايؤمن)) قيل : يارسول الله لقد خاب وخسر من هو ؟ قال : ((من لايأمن جاره بوائقه))[٨٢] **واتە : (سوێند بەخوا باوەڕ ناهێنێ (واتە:باوەڕی نیە) ئەم سوێندەی سێ جار دووپات کردەوە ئنجا پێی وترا : بەڕاستی سەرشۆڕو ڕسوا دەبێت ئەو کەسە کێیە ؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:((ئەو کەسەی دراوسێکەی متمانەی پێنەکاو لەخراپەی بترسێت)) .**

---

[٨١] اخرجه: البخاري (٦٤٧٥) . ومسلم (٤٧،٧٤)

[٨٢] اخرجه: البخاري (٦٠١٦) .ومسلم (٤٦) . قال الحليمي في (شعب الايمان)(ص:٢٦٩ ).(لان الجوار سبب الامن . فاذا اخاف الجار الجار كان كمن امنه رجل فعدى عليه فقتله فيكون قد جارى في الحسنة بالسيئة وذلك ملوم في الطبائع ومذموم في الشرائع) .

٢-پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ((ما آمن بي من بات شبعان وجاره جائعٌ الی جنبه وهو يعلم به))[٨٣].واتە: (باوەڕی بەمن نەهێناوە ئەو كەسەی كە تێربێت و دراوسێكەی برسی بێت لەپەنایدا وپێی بزانێت).
وەهەروەها دەفەرموێت: ((ليس المؤمن الذي يشبع وجاره جائع الى جنبه وهو يعلم))[٨٤].واتە: (باوەڕدار نیە ئەو كەسەی كە خۆی تێربێت ودراوسێكەی لەپەنایدا برسیبێت و پێی بزانێت) .

٣-پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : ((والذي نفسي بيده لايؤمن عبدٌ حتى يُحِبَ لِجاره أو قالَ لاخيه ما يُحَبُ لنفسه))[٨٥].
واتە : (سوێند بەوەی كە گیانی منی بەدەستە بەندە باوەڕدار نابێت تا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ دراوسێكەشی پێی خۆش بێت) .

---

[٨٢] اخرجه: الطبراني (الكبير)(٧٥١) .والبزار(١١٩) . وحسن اسناده كل من الهيثمي في (المجمع)(١٣٥٥٤) .والحافظ المنذري في(الترغيب)(٣٧٧٢) .وقال الشيخ الالباني في صحيح (الترغيب والترهيب)(٢٥٦١) صحيح لغيره .

[٨٣] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١١٣) .وصححه الشيخ الالباني في صحيح (الادب المفرد)(٨٢) .و(الصحيحة)(١٤٩) .

[٨٤] اخرجه:مسلم (٧٢،٤٥) .

٣ ) ئازاردانی دراوسێ لەڕیزی تاوانە گەورەکانە :

ئەم کارە ناپەسەندە لەبەر ئەو هەموو هەڕەشە توندو تیژانەی کە لەدوو توێی قورئان وسوننەتدا هاتووە ، وەلەبەر ئەو هەموو زیانە گەورانەی کە دەیگەیەنێت بەتاك و کۆمەڵگە ، وەلەبەر ئەوەی کە (لعنة) واتە: نەفرەت لەسەر ئەم کارە هاتووە و هەرکارێك نەفرەتی لەسەر هاتبێت بە تاوانی گەورە دەژمێرێت[٨٦] وە بۆ زیاتر ئاشنا بوون لە گەورەیی ئەم تاوانە بڕوانە ڕوون کردنەوەکانی ئیبن وحەجەر وصەنعانی ومحمدی کوڕی عبدولوەهاب[٨٧] .

٤ ) ئازار دانی دراوسێ دەبێتە هۆی لەناو چوون :

هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ناوی ثەوبانە (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((مامن جار يظْلِمُ جارهُ ويقهَرُهُ حتى يَحمِلَهُ على أن يخرُج من منزله الا هلك))[٨٨] واتە: (هەر دراوسێیەك زۆر و ستەم لەدراسێکەی بکات تاناچاری بکات لە ماڵەکەی دەربچێت ئەوە تیا

---

[٨٥] انظر: (الجواب الكافي)لابن القيم الجوزية (ص: ١٥٦) .

[٨٦] انظر: (فتح الباري)(١٠/٥٤٢) ، و(سبل السلام)(٤/٢١٨) ، و(الكبائر) لمحمد بن عبد الوهاب (ص:٨٨) .

[٨٧] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١٢٧) ،وصحح اسناده الشيخ الالباني في(صحيح الادب المفرد) برقم (٩٤) .

دەچێت)، ئەلقاسم (رضي الله عنه) دەیگێڕێتەوە ودەفەرموێت : (أنَّ ابابكر مرَّ بعبد الرحمن بن ابي بكر وهو يماظ (اي: يخاصِمُ اشَدَّ المخاصمة) جاراً لهُ فقال له : لاتُماظِ جارك فإن هذا يبقى وَيَذهَبُ الناس))[٨٩] واته : جارێکیان ئەبو بەکر تێپەڕی بەلای عەبدولڕەحمانی کوڕی دا وبینی زۆر بەتوندی دەمەقاڵێیەتی لەگەڵ دراوسێکەیدا ئەویش پێی ووت : دەمە قاڵە مەکە لەگەڵ دراوسێکەتدا چونکە ئەم کارە خراپە لای خوای گەورە دەمێنێ و خەڵکان نامێنن و دەڕۆن .

ئەگەر هاتوو دراوسێ زۆر خراپیش بوو تاگەیشتە ئەوەی کە دزی لێت کرد ئەوجاریش نابێت قسەی ناشرین وغەیبەت وگومانی خراپ وزیادە ڕەوی بکەیت بەرانبەر ئەو دراوسێیەت ، وەکو عەبدولای کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەفەرموێت : ((مايزال المسروق منه يتظَنّى حتى يصيرَ أعظم مِن السارق))[٩٠] واته : (بەردەوام خاوەن ماڵ کە شتی لێ دزراوە گومانی خراپ بەدزەکە دەبات هەتا وای لێ دێت لە دزەکە گەورە ترو و خراپ تردەبێت (واته :تاوانی لەتاوانی دزەکە گەورەتر دەبێت لای خوای گەورە) .ئەگەر ئێمە بەم جۆرە ڕەفتار نە کەین بەڕاستی ئەم کارە دەبێتە هۆی تێکدان پەیوەندی

---

[٨٨] اخرجه: ابن مبارك في(الزهد)(٦٥) وقال محققه : اسناده حسن .

[٨٩] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١٢٨٩) ،وصحح اسناده الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) برقم(٩٧٤) .

خەڵکی و بلاوبوونەوەی بێ متمانەی و ناشرین کردنی هەمووان ، وەك ئەسابەی بکری ﷺ دەفەرموێت : " آفة المروءة جيران السوء : إن رأوا حسناً دفنوه . وإن رأوا سيئاً أذاعوه"[٩١] واتە: (لە ناو چوونی پیاوەتی و چاکە لەرێگەی دراوسێی خراپەوەیە کاتێك چاکە یەك دەبینن لە دراوسێکەیان بلاوی ناکەنەوە بەلام ئەگەر خراپەیەکیان لێ بینی بلاوی دەکەنەوە و ناوی دەزڕێنن).

٥) ئازاردانی دراوسێ دەبێتە هۆی بەر کەوتنی نەفرەتی خوا و پاشان نەفردتی خەڵکان : ٩

نەفرەتی خوای گەورە تووشی ئەو کەسانەدێت کە زۆر خراپن لەگەڵ دراوسێکانیاندا ، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەفەرموێت : جارێك پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر (ﷺ) گلەی وگازندەی لە دراوسێکەی دەکرد ، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو : برۆ ئارامگربە-دوو جار یان سێ جار بەو جۆرە کابرا هات و پێغەمبەریش (ﷺ) هەمان وەلامی دایەوە-ئنجا پێی فەرموو:((أذهب فاطرح متاعك في الطريق)) واتە:(برۆ کەل وپەلی ناو ماڵەکەت فرێ دەرە سەر رێگاکە) ئەویش چوو کەل و پەلی ناو ماڵەکەی فرێدایە سەر رێگاکە ، ئنجا

---

[٩١] انظر : (جامع بيان العلم و فضله) لابن عبد البر برقم (٧٠٢) وقال محققه : اسناده لاباس به.

خەڵکان لێ ی کۆبوونەوە و پرسیاریان لێ کرد ووتیان ئەوە چی یە؟ بۆ وا دەکەیت ، ئەویش ووتی : دراوسێیەکەم هەیە ئازارم دەدات و منیش باسم کرد لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش فەرمووی : برۆ کەل و پەلەکانت فڕێ دەرە سەر ڕێگاکە . خەڵکانیش دەیان ووت: نەفرەتی خوای لێ بێت ،خوایە نەفرەتی لێ بکەیت و ڕیسوای بکەیت وای لێ بکەیت وای لێ بکەیت و هەندێکیان دوعایان لێ دەکرد ، بەم جۆرە هەر کەسێك بەوێ دا تێپەڕ بووایە نەفرەتی لێ دەکرد ، تا ئەو دراوسێ خراپە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ئای خەڵکان چیم پێ دەگەیەنن و دەڵێن؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : چیت پێ دەگەیەنن ؟ ووتی ئەوان نەفرەتم لێ دەکەن ، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی : (( إن لعنةَ الله فوقَ لعنَتِهِمْ –و في رواية– [قدْ لعنَكَ الله قبل الناس] )) واتە : (نەفرەتی خوا لە سەر نەفرەتی ئەوانەوەیە ، خوا نەفرەتی لێ کردوویت پێش خەڵکان) ، دراوسێ خراپەکەش ووتی : ئیتر من واز لەو کارە دەهێنم و ناگەڕێمەوە سەری ، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای دراوسێکەی و پێ ی ووت : کەل و پەلەکانت لەگەڵ خۆت بگەڕێنەرەوە بۆ خانوەکەت سوێند بە خوا من لێرە بە دواوە هەرگیز ئازارت نادەم . بگەڕێرەوە ئیتر هیچ شتێك لە من نابینیت کە پێت ناخۆش بێت . پاشان ئەو پیاوەی کە گلەی و گازندەکەی کرد بوولای پێغەمبەر

(ﷺ) هات و پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو کەل و پەلەکەت هەڵگرەوە ناڕەحەتیت لێ دوورکەوتەوە . ئەم بەسەرهاتە ئیمامی وبوخاری لە (الادب المفرد) وابی داود وئیبن حیبان وحاکم وطەبەرانی وبەزار ڕیوایەتیان کردووە وبەکۆکردنەوەی هەموو ڕیوایەتەکان وڕێکخستنی هەموو بەشەکانی باسەکە ئامادەکراوە بۆ ئەوەی بەوردی لە ڕووداوەکە بگەین[٩٢] .

## ٦ ) ئازاردان وهەر جۆرە دەست درێژیەك دژ بەدراوسێ دە بەرامبەر لەسەر خاوەنەکەی تۆمار دەکرێت :

میقدادی کوڕی ئەسوەد (ﷺ) دەفەرموێت : ((سأل رسول الله (ﷺ) أصحابه عن الزنى قال: [ماتقولون في الزنا] ؟ قالوا حرام حرّمه الله ورسوله . فهو حرام الى يوم القيامة قال : فقال رسول الله(ﷺ) ((لإن يزني الرجلُ بعشرِ نسوةٍ . ايسر عليه مِن ان يزني بامراة جاره)) ] وسألهم عن السرقة [قال ((ماتقولون في السرقة)) ؟ قالوا : حرَّمها الله ورسوله فهي حرامٌ قال : ((لإن يسرق الرجل من عشرة ابياتٍ ايسر عليه مِن أن يَسرِق

---

[٩٢] اخرجه: البخاري في(الادب المفرد)(١٢٤-١٢٥) . وابي داود(٥١٥٣) . والبزار(١٩٠٣) . والطبراني (الكبير)(٣٧٦٥) . وابن حبان(٥٢٠) وقال محققه اسناده قوي . والحاكم (٤ ١٦٦) وصححه ووافقه الذهبي . وقال المنذري في (الترغيب والترهيب)(٣٧٦٥) رواه الطبراني والبزار باسناد حسن . وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد)(٩٢-٩٣) . و(صحيح ابي داوود)(٤٢٩٢) . و(صحيح الترغيب والترهيب)(٢٥٥٨-٢٥٥٩) .

من [بيت] جاره] ))[٩٣] واتە : (پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد و فەرمووی : چی دەڵێن سەبارەت بەزینا (واتە:داوێن پیسی) ؟ ووتیان : حەرامە خوا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) حەرامیان کردووە و هەتا ڕۆژی کۆتایی حەرامە ، ئنجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:(ئەگەر پیاوێك زینا بکات لەگەڵ دە ئافرەتدا ئاسان ترە لەوەی کە زینا بکات لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەیدا ، ئنجا پرسیاری لێ کردن سەبارەت بە دزی ئەوان ووتیان :حەرامە خوداو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەگەر پیاوێك دزی لە دە خانوو بکات ئاسان ترە لەوەی دزی لە خانووی دراوسێکەی بکات).

ئیبن و مەسعود (ﷺ) پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد ووتی : ((يارسول الله : ايَّ الذنب اعظمُ ؟ قال ان تَجعَلَ لله نِداً وهو خلقَكَ ؟ قلتُ ثُمَ أي ؟ قال : أن تقتُلَ ولَدَكَ مخافة أن يَطعَمَ معَكَ ، قال :قلتُ ثُمَ أي ؟ قالَ أن تُزانيَ بحليلةِ جارِكَ))[٩٤] واتە : (ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کام تاوان گەورەترین و مەزنترین تاوانە ؟ فەرمووی : ئەویە کە لەگەڵ

---

[٩٣] اخرجه :البخاري في (الادب المفرد)(١٠٣) ، واحمد (٨/٦) ، والطبراني (الكبير)(٢٠ ، ٢١٠) . وصححه الشيخ الالباني في(صحيح الترغيب والترهيب)(٢٥٤٩) ، و(الصحيحة) (٦٥) ، وصحيح (الادب المفرد)(٧٦) .

[٩٤] اخرجه: البخاري (٤٤٧٧) ، ومسلم (٨٦) ، وابو يعلى (٥٠٩٨) ، وابو داود(٢٣١٠) ، والترمذي (٣١٨١) .

ئەو خوایەی کە دروستی کردوویت شەریك و هاوتایەك بڕیار بدەیت . ووتم ئەی دوای ئەو ؟ فەرمووی : ئەوەیە کەمنداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوا . ووتم : ئەی دوای ئەو؟ فەرمووی : ئەوەیە کە زینا لەگەڵ ژنی دراوسێکەتدا بکەیت).

ئیبن قەیم (رحمه الله) دەفەرمووێت : (گەورەترین جۆری زینا و داوێن پیسی داوێن پیسی کردنە لەگەڵ ژنی دراوسێدا چونکە زیناکردن لەگەڵ سەد ئافرەتدا کە مێردیان نەبێت ئاسان ترە لای خوای گەورە لەوەی کە داوێن پیسی بکرێت لەگەڵ ژنی دراوسێدا)[٩٥] .

## ٧ ) ئازاردانی دراوسێ هۆکارە بۆ نەچوونە ناو بەهەشت :

ئەنەسی کوڕی مالیك (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی : ((...والذي نفسي بيدِه لايدخُلُ الجنَّة عبدٌ لايأمن جارُهُ بوائقهُ))[٩٦] واتە : (سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ناچێتە بەهەشتەوە بەندەیەك دراوسێکەی متمانەی پێنەکاو لە خراپەی خۆی بپارێزێت) .

---

[٩٥] نظر (الجواب الكافي) (ص: ١٣١-١٣٢)

[٩٦] اخرجه: احمد (٣/ ١٥٤) . والحاكم (١/ ٥١١) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي .وابو يعلى(٤١٨٧) . وابن حبان(٥١٠) وقال محققه اسناده صحيح على شرط مسلم .وصححه الشيخ الالباني في (الصحيحة)(٥٤٩) .و(صحيح الترغيب والترهيب)(٢٥٥٥) .

**٨) ئازاردانی دراوسێ هۆکارە بۆیەخە پێگرتنی دراوسێکەی لە قیامەتدا :**

عەبدوڵای کوڕی عومەر (ﷺ) دەفەرموێت: زەمانێکمان بەسەر برد هەر یەکە لە ئێمە برا موسوڵمانەکەی خۆی بەشایستەتر دەزانی بەو دینارو درهەمەی کە خۆی هەیبوو ،بەڵام ئێستا دینارو درهەم لای هەر یەك لە ئێمە خۆشەویسترە لە برا موسوڵمانەکەی ، وەمن گوێم لێ بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو : ((کم من جارٍ متعلقٍ بجارهِ یومِ القیامة یقول [یارب سَل هذا لِمَ أغلَقَ عني بابه ومنعني فضله – وفي روایة : فمنع معروفه]))[٩٧] واتە : (چەندەها دراوسێ یەخەی دراوسێکەی خۆی گرتووە لە قیامەتدا ودەڵێت : ئەی خوایە پرسیار لەمە بکە بۆچی دەرگاکەی دادەخست بە ڕوومدا ، وچاکەکانی لەمن قەدەغە دەکرد).

ئەم کارە ئەوەندە گەورەیە لای خوای گەورە بەڕادەیەك کە هەموو مشت ومڕەکان لەسەر شتانی تری دونیا لە دوای مشت مڕو یەخەپێ گرتنی دراوسێدێت لە ڕۆژی لێ پرسینەوەدا .

---

(٩٦) اخرجه البخاري في (الادب المفرد)(١١١) . وابن ابي الدنيا(مكارم الاخلاق)(٣٤٥) .والاصبهاني في (الترغيب) (ص: ٢٢٣) . والمروزي في(البر والصلة)(٢٥١) وقال محققه اسناده حسن .وحسنه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد)(٨١) .و(الصحيحة)(٢٦٤٦) .

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : ((أول خصمين يوم القيامة جاران))[٩٨] واتە (یەکەم دەمە قاڵە لە قیامەتدا دەبێت دەمەقاڵکردن و یەخە پێگرتنە لە نێوان دوو دراوسێدا) .

**٩) کوشتن و نازاردانی دراوسێ نیشانەیەکە لەنیشانەکانی ئاخر زەمان :**

لە ئاخر زەماندا کە شیرازەی هەموو شتێك تێك دەچێت وديندارى لەلای خەڵکان زۆر لاواز دەبێت بەوێنەیەك کە تاکە پەیوەندیەکیان بە ئیسلامەوە شایەتومان دەبێت . ئالەو کاتەدا بێدینی و باوەڕ لاوازی وادەکات لە هەندێ دراوسێکە دەستی بچێتە خوێن و ناموسی دراوسێکەیەوە وکارامەبێت لە جۆرەکانی ئازاردانی دراوسێکەی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت : ((لاتقوم الساعة حتى يقتل الرجل جاره وأخاه وأباه))[٩٩] واتە : (ڕۆژی کۆتایی نایەتە پێش تاوای لێ دێت پیاو دراوسێکەی و براو باوکی خۆی دەکوژێت).وە لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((لاتقوم الساعة حتى يظهر الفحش و التفاحش و قطيعة الرحم و سوء

---

[٩٧] اخرجه: احمد(٤: ١٥١) . وحسنه الشيخ الالباني في صحيح الترغيب والترهيب)(٢٥٥٧) .

[٩٨] اخرجه: البخاري في (الادب المفرد)(١١٨) . وحسنه الشيخ الالباني في(صحيح الادب المفرد)(٨٧). و(الصحيحة)(٣١٨٥)

المجاورة ....))[١٠٠] . **واتە:(ڕۆژی کۆتای نایەتە تا خراپە و خراپە کاریەکان بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێن و پەیوەندی خزمایەتی دەپچرێت و کەس لەگەڵ دراوسێکەیدا باش نا بێت.**

**١٠) ئازاردانی دراوسێ هۆکارە بۆ چوونە ناو دۆزەخ :**

**ئەبو هورەیرە** (ﷺ) **دەفەرموێت** :" قال رجلٌ : یارسول الله إن فلانة [تصوم بالنهار وتقوم الليل] .يذكر من كثر صلاتها وصيامها غير أنها تؤذي جيرانها بلسانها .قال : ((هي في النار))"[١٠١] **واتە : (پیاوێك ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا** (ﷺ) **فلأن ئافرەت بەڕۆژ بەڕۆژووە بەشەو شەونوێژدەکات .باسی زۆر نوێژکردنی وخێرکردنی وڕۆژووگرتنی دەکرێت بەلأم ئازاری دراوسێکانی دەدات بە زمانی ؟ پێغەمبەر** (ﷺ) **فەرمووی : ((ئەوە لە دۆزەخدایە))** .

---

[١٠٠] اخرجه الحاكم (١ ٧٠) . واحمد (المسند) (٦٥١٤) وقال محققه الشيخ الأرناؤوط صحيح نحيره.

[١٠١] اخرجه احمد (٢ ٤٤) .والبخاري في (الادب المفرد) (١١٩) .وابن حبان (٥٧٦٤) . والحاكم (٤ ١٦٦) .وصححه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٨٨) .و(صحيح الترغيب) (٢٥٦٠) .و(الصحيحة) (١٩٠)

# پەناگرتن بە خوا لەدراوسێی خراپ لەناو گۆڕدا

دیارە بوونی دراوسێی چاك لەژیانی دونیادا بۆ موسوڵمان کەڵکی هەیە لەهەموو ڕوویەکەوە ، وەکو موحەمەدی کوڕی مونکەدیر(رحمه الله) کە (تابیعیە) دەفەرموێت :

(إنَّ اللهَ لَيُصلِحُ بصلاحِ العبد ولَدهُ ، وولَدُ ولَدِهِ ، ويحفظه في دويرته والدويرات التي حوله مادام فيهم)[١٠٢] واتە : (خوای گەورە بەهۆی چاکی بەندەوە کوڕەکەی وە کوڕی کوڕەکەی چاك دەکات ، وە دەیپارێزێت لە خانووەکەی داو خانوەکانی چواردەوریدا هەتا ئەو لەناویاندا بێت).

وەهەروەها خەیثەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان (رحمه الله) کە (تابیعیە) دەفەرموێت : (إنَّ اللهَ لَيَطرُد بالرجُلِ الشيطان من الآدَر)[١٠٣] واتە : (خوای گەورە بەهۆی پیاو چاکێکەوە شەیتان لە گەڕەکێك دەر دەکات و دوور دەخاتەوە).

بەم جۆرە دراوسێی چاك سوودی هەیە لەدونیادا وەپێی دەچێت لەناو گۆڕو ژیانی بەرزەخیشدا سوودی هەبێت ئەگەر نا بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) داوامان لێ دەکات کە پەنا بە خوا بگرین لە

---

[١٠١] اخرجه: ابن ابي شيبة في(المصنف)(١٣/٥٥٧) ، وابو نعيم في(الحلية)(٣/١٤٨) ، وابـن المبـارك في (الزهد) (٣١٤) وقال محققه :سنده صحيح .

[١٠٢] اخرجه: ابو نعيم في(الحلية)(٤/١١٧) ،وابن المبارك في(الزهد)(٣١٥) وقال محققه اسناده صحيح .

دراوسیّی خراپ لەگۆڕدا وەكو فەرموویەتی : ((اللهم إني اعوذُ بِكَ من جار السوءِ في دارالمقامِ فإن جار البادية– في رواية–[جار الدنيا]يتحول))[١٠٤].واتە: (خوایە من پەنا دەگرم بە تۆ لە دراوسیّ خراپ لە جێگەی مانەوە (واتە : ناو گۆڕ ) چونكە دراوسیّی دونیا دوور دەكەوێتەوە).لەم فەرموودەیدا پێغەمبەر (ﷺ) وشەی (جار الدنيا) بەكار هێناوە كەواتە پێ دەچێت (دار المقام) دراوسیّی ناو گۆڕ بێت. وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ) داوامان لیّ دەكات كە پەنا بە خوا بگرین لە دراوسیّی خراپ لە گۆڕدا وە دەفەرمووێت:((اِستعيذوا باللهِ من شرِّ جار المقام فإنَّ جار المسافر اِذا شاءَ أن يزايَلَ زايَلَ))[١٠٥] واتە : پەنا بگرن بەخوا لەخراپەی دراوسیّی جێ مانەوە چونكە دراوسیّی ڕێبوار ئەگەر مەبەستی بێت ئەویّ بەجیّبهێڵێت ئەو جێگەیە بەجیّ دەهێڵێت .

وەلەڕیوایەتێكی تردا دەفەرمویّت : ((تَعَوَّذوا بالله من جار السوء في دار المقام ، فإن جار البادية يتحول عنك))[١٠٦] واتە : (پەنا بەخوا بگرن

---

[١٠٣] اخرجه : البخاري في (الادب المفرد ) (١١٧) ، و النسائي (٨ ، ٢٧٤) ؛ و ابن حبان (١٠٢٩)، و حسنه الشيخ الالباني في (صحيح الادب المفرد) (٨٦) ، و( صحيح الترغيب ) (٢٥٥٦) ، و( صحيح الجامع ) (٢٩٠) .

[١٠٤] اخرجه: الحاكم(١/٥٣٢) وصححه على شرط مسلم ووافقه الذهبي والشيخ الالباني في(الصحيحة)(١٤٤٣) .

[١٠٥] اخرجه:النسائي(٢/٣١٩) ، وصححه الشيخ الالباني في(صحيح الجامع)(٢٩٦٧) .

لە دراوسێی خراپ لە جێگەی مانەوە ، چونکە دراوسێی دەوارنشینی (واتە:دراوسێی دونیا) لێت دوور دەکەوێتەوە و ولات چۆڵ‌دەکات .

وەهەروەها عوقبەی کوڕی عامیر (ﷺ)دەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو : ((اللهم إني أعوذ بكَ من يوم السوءِ و مِن ليلة السوءِ و مِن ساعة السوءِ و مِن صاحِبِ السوءِ ، و مِن جارِ السوءِ في دار المقامِ))[١٠٧] واتە: (خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم لە ڕۆژی خراپ وە لە شەوی خراپ وە لە کاتی خراپ (واتە : کاتژمێر) وە لە هاوڕێی خراپ ، وە لە دراوسێی خراپ لە جێی مانەوە).

## چۆنیەتی ڕەفتار کردن لەگەڵ دراوسێی خراپدا

ئیمامی زەهەبی(رحمه الله) دەفەرموێت : ((ئەگەر دراوسێ خاوەن گوناهی گەورە بێت لە دوو شت بە دەر نیە ، یان ئەوەتا بە پەنامەکی ئەو کارە خراپانە ئەنجام دەدات و دەرگاکەی لە خۆی دادەخات ، با موسوڵمانی دراوسێی پشتی لێ هەڵ بکات و گوێی نەداتێ وە ئەگەر توانرا بە نهێنی با ئامۆژگاری بکرێت ، وە ئەگەر خراپە کاریەکانی بە ئاشکرا ئەنجام دەدا لێی دوور بکەوەردوە بە لێ دوور کەوتنەوەیەکی جوان ، و بەو جۆرەش ئەگەر زۆر کات

---

[١٠٦] اخرجه: الطبراني في الكبير (١٧، ٢٩٢)، و حسنه الشيخ الالباني في (صحيح الجامع)(١٢٩٩) .

نوێژی نەدەکرد ، دەبێت فەرمانی بە چاکە پێ بکەیت و ڕێگربیت لە خراپەی جار لە دوای جار ، ئەگەر وا نەبوو لە پێناوی خوادا لێی دوور بکەوەرەوە بەڵکو دەست بەردار ببێت لەو کارە خراپانە بە هۆی لێ دورکەوتنەوەت ، ئەمەش بە بێ ئەوەی کە گفت و گۆت یان سلاو کردنت یان دیاری پێ بەخشینت لێ دابڕیبێت ، وە ئەگەر بینیت زۆر یاخیە و دوورە لە خێر ئەو جار پشتی لێ هەڵ بکە و هەوڵ بدە لە دراوسێیەتی دوور بکەوەرەوە ، وە ئەگەر دراوسێکەت خۆی یان ژنەکەی داوێن پیسیان دەکرد و باکیان نەبوو لەو کارە ، ئەوا بگوێزەرەوە ، یان زۆر هەوڵ بدە کە زیان بە خێزانت نەگەیەنن چونکە ئەوکارە خراپە کاری یەکی زۆری تیایە و لێی دوور بکەوەرەوەو بە هیچ جۆرێك نەچیتە ناو خانوەکەیەوە، و هەموو جۆرە ڕێز و خۆشەویستی یەکی لێ قەدەغە بکە ، و داوایان لێ بکە بە نەرمی و هەڕەشە و تەماع کە لە دراوسێیەتیت دەربچن و بگوێزنەوە .

وە ئەگەر دراوسێیەکەت خاوەن داهێنراوی (بدعە)ی گەورە بوو: ئەگەر توانیت زۆر هەوڵ بدە تا فێری بکەیت و ببیتە هۆکاری ڕێنموی بۆی ، وە ئەگەر ئەو کارەت پێ ئەنجام نەدرا ئەوا زۆر ڕووی تێ مەکە و خۆشت نەوێت و هاوەڵیەتی مەکە و تێکەڵی مەکە و بگوێزیتەوە باشترە .

وە ئەگەر دراوسێکەت لە گەڕەکدا یان لە کوڵاْندا یان لە باخ دا جوولەکە بوو یان گاور ئەوە بە چاکی ڕەفتاری لەگەڵ بکە وئازاری مەدە و تێکەڵیان مەکە و پێ‌مەکەنە بە دەمیانەوە و خۆشت نەوێن وە لە پێشدا سلاْویان لێ مەکە و ئەگەر یەك لەوان سلاْویان لێ کردیت لە وەلاْمدا بڵێ : لە سەر ئێوەش ، یان ئێوارەتان باش یان بەیانیتان باش ئەمەش خراپ نیە بە بێ ئیسراف و گەرمی وەلاْم دانەوەیان ، چونکە باوەڕدار دەبێت خۆ بە کەم زان و کزوڵاْنە مامەڵە بکات لەگەڵ برایانی باوەڕداری خۆیدا و سەربەرزانە و بە عیزەتەوە مامەڵە بکات لەگەڵ کافراندا لەبەر ڕێز و شکۆی ئیسلام و بەرز ڕاگرتنی ))[١٠٨] .

---

[١٠٧] انظر: (حق الجار) للأمام الذهبي (ص :٤٦-٤٩) نقلاً عن (حقوق الجار) للشيخ علي حسن (ص: ٤٣) .

# کۆتایی

برای موسوڵمانم ئا ئەمەبوو مافەکانی دراوسێ لە فەرموودە ڕاستەکاندا وە لە ووتەکانی زانایانی پێشینی ئەم ئومەتە کە بە ڕاستی هەموو گۆشەکانی ئەم باسە گرنگەیان خستە ڕوو ، با ئێمەش سودیان لێ وەربگرین و بە خۆماندا بچینەوە تا بزانین ڕەفتار و هەڵسوکەوتمان لەگەڵ دراوسێکانماندا چۆنە ؟ و ئایە لە ئاستی ئەو فەرموودە و ئامۆژگاریانەین و کەڵکمان لێ وەرگرتوون ، و توێشوی باشمان لەم ڕووەوە بۆ قیامەتمان ئامادە کردووە ، وە ئەگەر تا ئێستەش کەم و کوڕیمان هەبوو بێت لەم بوارەدا با هەوڵی سڕینەوەیان بدەین و کاری چاکە لە جێگەیاندا بنێژین ، وەك پێغەمبەری (ﷺ) دەفەرموێت : (( فِتنة الرجُل في اهلهِ و مالِهِ و ولدِهِ وجارِهِ تُكَفِرُها الصلاةُ و الصومُ و الصدقةُ [و الأمر بالمعروفِ و النهيُ عن الُمنكر] ))[١٠٩] الفتنة : بە مانای تاقیکردنەوە دێت و زۆر جاریش بە مانای تووش بوون و کەوتنە ناو کاری خراپە دێت. لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت موسوڵمان هەر کەم و کوڕی و ستەمێکی بەرامبەر خێزانی و منداڵەکانی و دراوسێکەی کردبێت بە نوێژ و ڕۆژو و چاکە کردن و فەرمان کردن

---

[١٠٨] اخرجه: البخاري (٥٢٥ ، ٣٥٨٦ ) .

بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە دەسڕێتەوە و تاوانەکەی نامێنێت . با ئێمەش زۆر باش ئاگاداری ئەم کارە چاکانە بین کە دەبێتە هۆی (کفارة) و سڕینەوەی تاوانەکانمان تا ئەو کەم و کوڕیانە لە خۆماندا نەهێڵین .

داواکارم لە خوای گەورە زیاتر ئاشنا و حاڵیمان بکات لە ئاینەکەی خۆی وە زانیاریەکانمان زیاد بکات وە بیکاتە مایەی سود لێ وەر گرتنمان _ آمین _

ربنا تقبل منا انك أنت السميع العليم
وآخر دعوانا إن الحمد لله رب العالمين
والصلاة و السلام على نبينا محمد
وعلى آله و صحبه و سلم تسليما

**باوکی عەبدوڵلا**

**محمد ملا فائق شارەزوری**

# بابەتەکان

## پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

* بەردەوام جبریل (علیه السلام) ئامۆژگاریی دەکردم دەربارەی دراوسێ، هەتا گومانم وابوو کە میراتی دراوسێکەی دەبات.

* گەر گوێت لێبوو دراوسێکانت دەیانوت: تۆ چاکت کردووەو چاکەکاریت، ئەوا تۆ چاکەکاریت، گەر گوێت لێبوو دەیانوت: تۆ خراپەت کردووەو خراپەکاریت، ئەوا تۆ خراپەکاریت.

* خوایە من پەنا دەگەرم بە تۆ لە دراوسێی خراپ، لەجێگەی مانەوە، واتە (ناو گۆڕ)، دراوسێی دنیا.

Sherko Khanzadi